دەردەچێت و، دەبێت بە ئەندامێكی سوودبەخشی ناو وڵات و هاووڵاتی‌یان. بە ڕادەیەك كە هەندێك لەو كەسانەی لە بەندیخانەكەی دەنیزلی لەگەڵ ئێمەدا بەند كرابوون، دوای ئەوەی لە ماوەیەكی گەلێ كورت و كەم خایەندا چەندین وانە و ئامۆژگاری‌یان لە بارەی ئیمان و ڕەوشت بەرزی‌یەوە لە "پەیامەكانی نوور" وەرگرت، وتیان:

(ئەگەر بەندكراوان لە ماوەی پێنج حەفتەدا دەرس و ئامۆژگاری لە پەیامەكانی نوور وەربگرن، گەلێ باشترە بۆ ڕاستكردنەوەی هەڵسوكەوتیان، تاكو ئەوەی پازدە ساڵ بخرێنە بەندیخانەوە)!

جا مادەم مردن لەناوناچێت و كاتەكەشی پەردەی غەیبی بەسەردا دراوەتەوە و هەموو دەمێك دەگونجێ ڕووبەڕووی ببینەوە..

هەروەها دەرگای گۆڕیش داناخرێت و، كاروانەكانی مرۆڤایەتی یەك لە دوای یەك لە پشت ئاسۆی گۆڕستانەوە ئاوا دەبن..

هەروەها مردن خۆیشی بۆ ئیمانداران وەك نامەی تەسریح و ڕزگار كردن وایە لە ئیعدامی هەمیشەیی - وەك بە "ڕاستی"ی قورئان ئەمە ڕوون كراوەتەوە - بۆ گومڕا نەفامەكانیش ئیعدامێكی هەتاهەتایی‌یە، وەك خۆیان وای دەبینن، چونكە مردن جودایی‌یەكی هەمیشەییە لە هەموو كەسوكار و خۆشەویستانیان، تەنانەت لە هەموو بوونەوەرانیش بە گشتی..

مادەم ئەمە وایە.. ئەوا بێ هیچ گومانێك بەختەوەرترین مرۆڤ ئەو كەسەیە كە:

شوكرانەی پەروەردگاری بكات و، لە بەندیخانەكەیدا ئارامگر و چاوەڕوانی پاداشتی خوای گەورە بێت و، دەرفەت لە كاتەكانی ئەوێی ببینێت و، بە جوانترین و باشترین شێوە بەكاریان بهێنێت و، بەپێی ڕێنمایی پەیامەكانی نوور بۆ خزمەتی ئیمان و قورئان تێبكۆشێت.

ئەی مرۆڤی تووشبووی لەزەت و چێژی دنیا!

لە ماوەی حەفتا و پێنج ساڵی تەمەنمدا و، بە هەزاران تاقیکردنەوەی ژیانم و ئەو ڕووداوانەی بەسەرم هاتوون، دڵنیا بووم لەوەی کە:

تام و چێژی ڕاستەقینە، کە ئازاری ئاوێتە نەبێت و، خۆشییەك خەم و پەژارە لێڵی نەکات و بەختەوەریی ڕاستەقینە و بێگەرد و تەواو، تەنها بە "ئیمان" دەست دەکەوێت و لەناو بازنەی "ڕاستییەکانی ئیمان"دایە. دەنا بێ ئەم ئیمانە، تەنها یەك دانە لەزەتی دنیا چەندەها ئازاری زۆر و زەبەندی تێدایە، چونکە کاتێ کە دنیا لەزەتێکی بە ئەندازەی دەنکە ترێیەکت پێشکەش دەکات، دە دانە زللەی توندی بەسۆیشت تێ دەسرەوێنێت، بەمەش تام و لەزەتی ژیانت لێ دەسێنێتەوە.

ئەی ئەو بێچارانەی کە دووچاری بەڵا و گرفتاری موسیبەتی بەندیخانە بوون!

مادەم دنیاکەتان لە گریان و خەمباریدایە و، ژیانیشتان بە ئازار و بەڵا و موسیبەت لێڵ بووە، ئەوا تا دەتوانن تێبکۆشن دوارۆژیشتان بە گریان و پەژارەوە لێ نەگوزەرێت و، ژیانی هەمیشەییتان بەختەوەر و شیرین بێت.

کەواتە برایانم! ئەم هەلە لەدەست مەدەن، چونکە هەروەك دەکرێت ئێشکگرتنی ماوەی یەك سەعات بەرامبەر سوپای دوژمن لە بارودۆخێکی دژواردا، بە خواپەرستیی ماوەی یەك ساڵ بژمێررێت، ئەوا هەموو سەعاتە سەختەکانی ژیانی بەندیخانەتان، لەودنیادا بە چەندەها سەعاتی خواپەرستی بۆ دادەنرێت، گەر فەرزەکانتان بەجێبهێنن. دیارە ئەو کاتەش دەردیسەری و بارە ناخۆشەکانتان بۆ دەبێت بە میهرەبانی و لێبوردن.

* * *

باسمه سبحانه

السلام علیكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

برا ئازیز و بەوەفاكانم!

سێ ڕووناكیی دڵدەرەوەم دی، وا لـە سێ خاڵدا ڕوونیـان دەكەمـەوە بۆ ئەوانەی كە دووچـاری بەندیخانـە بـوون و، ئەوانـەی چاودێری‌یـان دەكـەن و، ئەوانەش كە لە ئیش و كار و گوزەرانیاندا یارمەتی‌یان دەدەن:

خاڵی یەكەم:

دەكرێ و دەگونجێ هەموو ڕۆژێكی ئەو تەمەنەی كە لە بەندیخانەدا بەسـەر دەبرێـت، پاداشـتی پەرستنی دە دانـە ڕۆژ دەسـتی مـرۆڤ بخـات و، ئـەو سەعاتانەش كە لە ئەنجامدا لەناو دەچن، دەگونجێ بكرێن بـە چـەندین سـەعاتی نەمر و هەتاهەتایی. بگرە دەگونجێ بردنەسەری چەند سـاڵێك لـە بەندیخانـەدا، بكرێت بەهۆی ڕزگاربوون لە ملیۆنەها ساڵی بەندیخانەی هەمیشەیی.

مـەرجی ئـەم قازانجـە مەزنـەی ئیمـانداران، بەجێـهێنانی فـەرزەكان و، پەشیمان بوونەوەیە لـە بەردەم خـوای گـەورەدا لـەو تـاوان و گـوناهانەی گـەیاندوویانەتە بەندیخانە و، شـوكرانە بژێری و، ئارامگرتنـە تەنـها لەبـەر خـوای گـەورە. سـەرەڕای ئـەوەی كـە بەندیخانـە خۆیشی دەستی مرۆڤ لـە گەلێ گوناهـ دەگێڕێتەوە.

خاڵی دووهەم:

نەمانی ئازار لەزەتە و، نەمانی لەزەتیش ئازارە..

بەڵێ، هەركەسێك بیر لە ڕۆژانی خۆش گوزەرانیی ژیـانی بكاتـەوە، ئەوا لە گیانی خۆیدا هەست بە خەم و خەفەت دەكات بۆ نەمانیان، بە چەشنێ كە وشەی ئاخ و داخی حەسرەت و پەژارە لە زمانی دەردەچێت. بەڵام ئەگەر بیر

لە ڕۆژگارانی بەلاّ و موسیبەتی بکاتەوە، ئەوا لە دڵ و گیانی خۆیدا هەست بە خۆشـی و شـادیی نـەمانیان دەکـات و، زمانیشـی بـە وتنـی: "الحمـد لله" و دەربڕینی شوکرانەبژێریی خواوەند، ئەو خۆشی‌یە دەردەبڕێت، چونکـە بـەلاّ و گیروگرفتەکانی ئەو ڕۆژانە ڕۆشتن و پاداشتیان پاشەکەوت کرد.

ئیتر ئەو مرۆڤە دڵی بەمە دەکرێتەوە و بۆ خۆی دەحەوێتەوە.

واتە ئازارێکی کاتیی یەك سەعات، تـام و لـەزەتێکی مەعنەوی لـە گیـاندا بـەجێ دەهێڵـێت.. بە پێچەوانەشـەوە لـەزەتێکی کـاتیی تەنـها یـەك سـەعات ئازارێکی مەعنەوی لە گیاندا دوای خۆی بەجێ‌دەهێڵێت!

جا مادەم "ڕاستی" بەم جۆرەیە و، مادەم سـەعاتەکانی بـەلاّ و موسـیبەتیش، کە لەگـەڵ ئازارەکانیـاندا ڕۆشـتن و بەسـەرچوون، وەکـو ئـەوە وان کـە هـەر نەبوو بێتن..

مـادەم ڕۆژگـارانی بـەلاّ و موسـیبەتی ئـایندەش هێشتا نـەهاتوون، کەواتـە ئەوانیش وەك "نەبوو" وان. خۆ دیارە شتی "نەبوو" ئازاری نی‌یە..

ئەوا دەربڕینی بێ ئارامی و ترس و بیم لە ئازارەکانی ڕابـوردوو، هـەروەها ئەوانەی ئایندەش کە هێشتا نەهاتوون و هەموویان لە حوکمی "نەبوو"دان، بـە گێلی و نەفامی دادەنرێت.

هەروەها سکالاّ دەربڕیـن لـە دەسـت خـوای گـەورە و، لـێ نەپرسینەوەی دەروونـی بـەدخوازی پڕقسـوور و، کـات بەسـەربردن بـە حەسـرەت و هەنسکدان و خەم هەڵڕشتن.. هەموو ئەمانە، ئەوپەڕی نەفامین.

ئایا ئەو کەسەی کە ئەمە حاڵیەتی لەوە نەفامتر نی‌یە کە لە ترسی برسێتی و تینوێتیی ڕۆژانی ئایندەی، هەر لە بەیانی‌یـەوە تـا ئێـوارە، خـەریکی خـواردن و خواردنەوە بێت؟

بەڵێ، ئەگەر مرۆڤ هێزی ئارامگرتنی خۆی بە ڕاست و چەپدا – واتە بە ڕابوردوو و ئایندەدا – بڵاو نەکاتەوە و، ئاراستەی تەنها ئەو ڕۆژەی بکات کە تیایدایە، ئەوا تەنها ئەو هێزەی سەروزیادە بۆ کردنەوەی گرێ کوێرەی هەموو تەنگ و چەڵەمەکانی ژیانی.

تەنانەت من دەڵێم و – سکاڵاش ناکەم – ئەو سەختڵەتکردنە ماددی و مەعنەوییانەی کە لەم قوتابخانە یووسفییە سێهەمەدا[٢] و لەماوەی چەند ڕۆژێکدا هاتنە ڕێم، بە درێژایی ژیانم شتی وام نەدیوە، بە تایبەت بێ بەش کردنم لە خزمەتگوزاریی نوور، لەکاتێکدا کە چەندین نەخۆشی سەری تێ کردووم..

جا لەو کاتەدا کە دڵ و گیانم بە دەست ئەم هەموو تەنگی و نائومێدییەوە پێکەوە دەگووشران، چاودێریی خوای گەورە ئەو ڕاستییەی پێشووی بە هاناوە ناردم. ئیتر دڵم بە تەواوی کرایەوە و ئەو دڵتەنگی و سەختڵەتییانەم نەمان و بە ئازاری بەندیخانە و نەخۆشی ڕازی بووم. چونکە هەر کەسێك وەك من لە لێواری گۆڕەکەیدا بێت، گەلێ قازانجیەتی یەك سەعاتی تەمەنی – کە دەگونجێ بە بێ ئاگایی لێی بڕوات – بە دە سەعات پەرستن بۆ بژمێررێت.

ئیتر شوکرانەیەکی زۆرم لەسەر ئەمە پێشکەشی خوای گەورە کرد.

خاڵی سێهەم:

یارمەتیدانی پڕ سۆز و بەشەفەقەتی بەندکراوان و، بە دەست گەیاندنی ڕزق و ڕۆزییان کە پێویستیان پێیەتی و، چارەسەر کردنی زامە مەعنەوییەکانیان بە مەلهەمی دڵنەوایی و دڵدانەوە..

---

(٢) مەبەست بەندیخانەی شاری (ئافیون)ە کە ساڵی ١٩٤٨ از مامۆستا نوورسی و قوتابییانی نووری تێدا بەند کران. (وەرگێڕ)

هەر یەك لەمانە هەرچەندە كارێكی ئاسانە، بەڵام پاداشتی گەلێ مەزن و زۆری تێدایە، چونكە بە دەست گەیاندنی ئەو ڕۆزی‌یەی كە لە دەرەوە بۆیان دێت لە حوكمی "سەدەقە"دایە و، لە تۆماری كردەوە چاكەكانی ئەو كەسەدا دەنووسرێت كە ئەو ڕۆزی‌یەی بە دەستی ئەو بەندكراوە گەیاندووە، چ ئەوانەی لە دەرەوە بۆیان هێناوە، چ پاسەوانەكان، چ ئەو چاودێرانەش كە لەم كارەدا یارمەتی‌یان دەدەن. بە تایبەت ئەگەر بەندكراوەكە پیر و بەتەمەن، یان نەخۆش، یان ئاوارە و دوور لە شاری خۆی، یان هەژار و نەدارا بێت، ئەوا پاداشتی ئەو "سەدەقە مەعنەوی‌یە" گەلێ زیاتر دەبێت.

مەرجی ئەم قازانجە: ئەنجامدانی فەرزەكانە، تاكو ئەم خزمەتگوزاری‌یە تەنها لەبەر خوای گەورە بێت. لەگەڵ مەرجێكی تردا كە بریتی‌یە لەوەی ئەو خزمەتگوزاری‌یە هاوڕێی شەفەقەت و بەزەیی و سۆز و میهرەبانی و خۆشەویستی بێت و، هیچ منەتێكی ئاوێتە نەبێت.

* * *

باسمه سبحانه

﴿وان من شيء إلاّ يسبح بحمده﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

ئەی برایانی ئایینی و هاوەڵانی بەندیخانەم!

وام بە دڵدا هات كە ڕاستی‌یەكی گرنگی وەهاتان بۆ ڕوون بكەمەوە - پشت بە خوای گەورە - لە ئازاری دنیا و قیامەت ڕزگارتان بكات.

ئەو ڕاستی‌یەش ئەمەی خوارەوەیە كە بە نموونەیەك ڕوونی دەكەمەوە:

گریمان كەسێك برای، یان خزمی، كەسێكی تری كوشت. دیارە ئەم كوشتنەی كە لەبەر لەزەتی لەخۆ بایی‌بوونی تۆلەسەندنەوەیە و، تەنها یەك خولەك دەخایەنێت، ئەشكەنجەی ملیۆنەها خولەكی دڵتەنگی و ئازاری بەندیخانەی لێ پەیدا دەبێت. لە هەمان كاتدا كەسوكاری كوژراوەكەیش هەمیشە لە نیگەرانیدان و، هەر كاتێك بكوژەكەیان بیر دەكەوێتەوە و كەسوكاری دەبینن، بۆ دەرفەتێك دەگەڕێن تاكو تۆڵەی خۆیان بسێننەوە..

بەم جۆرە لەزەتی تەمەن و خۆشگوزەرانیی ژیانیان، بەدەم ئازاری بەسۆی ترس و بیم و دڵە تەپێ و ڕق و قینەوە لەدەست دەردەچێت و، هەردوو لایان لە ئازارێكی سەختدا دەتلێنەوە.

ئەم دەردە هیچ چارەسەری و دەرمانێكیشی نی‌یە جگە لە سوڵح و ڕێككەوتن كە قورئانی پیرۆز فەرمانی پێ دەدات و حەق و ڕاستی داواكاری دەبن و، بەرژەوەندیی هەردوو لایشی تێدایە و، مرۆڤایەتی داخوازیەتی و، ئایینی ئیسلامیش هەردوو لای بۆ هان دەدات.

بەڵێ، بەرژەوەندی و ڕاستی لە ڕێككەوتندایە و كارێكی گەلێ باشە، چونكە "ئەجەل" هەر یەكێكە و گۆڕانی بۆ نی‌یە. هەرچۆن بێت دەبوو ئەو كوژراوە هەر ژیانی بەجێ بهێشتایە و نەمایە، مادەم ئەجەلی هاتبوو، بكوژەكەیش بوو بە هۆكاری ئەنجامدانی ئەو قەزایەی خوای گەورە. جا ئەگەر هەردوو لا ڕێك نەكەون، ئەوا ماوەیەكی گەلێ زۆر و درێژخایەن لە ترس و بیم و ئازاری تۆڵەسەندنەوەدا دەتلێنەوە. هەر لەبەر ئەوەشە كە ئایینی ئیسلام فەرمانی داوە لە سێ ڕۆژ زیاتر موسڵمان لە برای موسڵمانی دەنگ دانەبڕێت.

جا ئەگەر ڕووداوی ئەو كوشتنە ئەنجامی دوژمنایەتی‌یەكی كۆن و ڕقەبەرایەتی‌یەكی ڕەگداكوتاو نەبێت و، مونافقێك هۆكاری هەڵگرساندنی

ئاگری ئەو فیتنە و ئاژاوەیە بووبێت، ئەوا دەبێ یەکسەری ڕێـك بکـەون. دەنـا ئەو موسیبەتە بچووکە گەورە دەبێت و درێژە دەکێشێت، گەر هەردوو لایـش ڕێك بکـەون و بکوژەکـەیش لـە تاوانەکـەی خۆی پەشیمان ببێتـەوە و تۆبـە بکات و بە بەردەوامی دوعـای خێر بۆ کوژراوەکە بکـات، ئـەوا هـەردوو لا دەسـتکەوتی زۆریـان دەسـتگیر دەبێـت. چونکـە خۆشەویسـتی و ئولفـەت دەکەوێتە نێوانیانەوە و ئەم لە دوژمنەکەی خۆش دەبێت و لـە بریی یەك بـرا کـە کۆچی کرد چەندین برای باش و خواناسـی دەست دەکـەوێت و هـەردوو لا پێکەوە مل بۆ قەزا و قەدەری خوای گـەورە کـەچ دەکـەن، بـە تایبـەت ئەگـەر لەوانە بن کە گوێ بۆ دەرس و ڕێنمایی‌یـەکانی "نـوور" ڕادەگـرن، ئەوانـە لـە هەموو کەس زیاتر داوایان لـێ دەکرێت دوورەپـەرێزی لـە هـەر شتێك بکـەن کە نێوانی دوو کەس تێك بدات، چونکـە ئەو برایەتی‌یەی کە لە چوارچێوەی نووردایە و دەیانبەستێت بە یەکەوە و، پاشان بەرژەوەندیی گشتی و، ئنجا ئـەو دڵسافی و دەروون ساغی‌یەش کە ئیمان داوای دەکات لێیان..

هـەموو ئەمانـە، داخـوازی پشـتگوێ خسـتنی نـاکۆکی و، دامـەزراندنی ئاشتی و تەبایی دەبن.

ئەمـەی باسمـان کـرد، لـە ڕاستیدا، لـە بەندیخانـەی دەنیزلی لــە نێـوان دوو بەندکراودا - کە دوژمنایـەتیی یـەکتریان دەکـرد - ڕووی دا. دوای ئـەوە، بـە فەزڵی خوای گەورە و پـاش وەرگرتنـی چـەند وانەیـەك لـە پەیامـەکانی نـوور، بوون بە برای خۆشەویستی یەکتر، تەنانـەت بـوون بـە یـەکێ لـە هۆکارەکـانی تەربیـە بوونمـان، بـە ڕادەیـەك کـە مولحیـد و نەفامـەکانیش لــە بـەردەم ئـەم خۆشـەویستی‌یە برایانەی ئەو دوانەدا هیچیان بۆ نەمایەوە و ناچار بوون بڵێـن: "ما شـاء الله.. بـارك الله.."! بـەم جۆرە دڵـی هـەموو بـەندکراوان گەشـایەوە. چونکە لێرەدا بە چاو دەبینین کە چۆن ستەم لـە بـەندکراوان دەکرێـت و، بـە

تاوانی یەك كەس توندوتیژی لەگەڵ سەد كەسیاندا دەنوێنرێت، بە ڕادەیەك كە لە كاتی حەوانەوەشدا نایەڵن ئەو سەد كەسە لەبەر تەنها ئەو تاوانبارە بڕۆنە ناو حەوشەی بەندیخانەكەشەوە!

بەڵام مرۆڤی ئیمانداری بەغیرەت، جوامێرییەكەی هەرگیز ڕێی ئەوەی پێ نادات كە ئازاری هیچ ئیماندارێك بدات، چ جای ئەوەی لە پێناوی سوودی هەندەكی و كەمی خۆیدا بیێت بەهۆی ئازاردانی. كەواتە دەبێ هەر كە بە هەڵەی خۆی زانی و هەستی بەوە كرد كە بووە بەهۆی ئازاری ئیماندارێك، یەكسەر بە پەلە تۆبە بكات و بۆ لای خوای گەورە بگەڕێتەوە.

* * *

باسمه سبحانه

﴿وإن من شيء إلاّ يسبّح بحمده﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

ئەی برا ئازیزە نوێیەكانم و ئەی بەندكراوانی پێشوو!

ئێستا گەیشتوومەتە قەناعەتێكی یەكجار تەواو بەوەی كە عینایەتی خوای گەورە ئێمەی لەبەر ئێوە گەیاندووەتە ئێرە. واتە هاتنمان بۆ ئێرە لەبەر بڵاوكردنەوەی ئەو دڵدانەوە و دڵنەواییەیە كە "پەیامەكانی نوور" بۆ ئێوەیان هێناوە و، بۆ كەمكردنەوەی گوشارەكانی بەندیخانەیە لەسەرتان، بەهۆی "ڕاستییەكانی ئیمان" و، لەبەر پاراستنتانە لە گەڵێ بەڵا و موسیبەت و تەنگانەی ژیان و، بۆ دەربازكردنی ژیانی پڕ خەم و پەژارەتانە لە بێ مەبەستی و بێ سوودی و، بۆ ڕزگاركردنی ئەودنیاشتانە تاكو وەك ئەم دنیاتان لە گریان و خەم و پەژارەدا نەبێت!

جا مادەم ڕاستی ئەمەیە کە باسمان کرد، ئەوا دەبێ ئێوەش وەك قوتابیانی نوور و وەك ئەوانەش کە لە بەندیخانەی دەنیزلی لەگەڵماندا بوون، ببن بە برای خۆشەویستی یەکتری.

ئەوەتا بە چاوی خۆتان دەبینن ئەو پاسەوانانەی کە سوورن لەسەر خزمەت کردنتان، بە دەست پشکنینەوە گەلێ ماندوو دەبن، تەنانەت خواردنەکانیشتان دەپشکنن نەوەك ئامێرێکی تیژی تێدا بێت! ئەمەش لەبەر ئەوەی کارێك ڕوونەدات کە دەستدرێژی بکەنە سەر یەکتری، وەك بڵێی ئێوە دڕندە و خوێنمژ بن و، هەرکەسە بە ئارەزووی خۆی پەلاماری ئەوی تر بدات تاکو بیکوژێت. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە دەرفەتی پشوودان و حەوانەوەشتان نادرێتێ، نەوەك شەڕ و ئاژاوەتان لە نێواندا دروست ببێت!

دەسا ئێوە و ئەو برایانەش کە تازەکی هاتوونەتە بەندیخانەوە و، وەکو ئێوە خاوەنی ئازایەتی و جوامێریەکی سروشتین، هەمووتان بەوپەڕی ئازایەتیی مەعنەویەوە لە بەردەم دەستەی سەرپەرشتیارانی بەندیخانەدا بڵێن:

(نەك تەنها شتی تیژ، بەڵکو ئەگەر چەکە تازەکانیشمان بدەنێ، ئێمە هەر دەستدرێژی ناکەینە سەر ئەو برا و هاوەڵانەمان کە لەگەڵماندا دووچاری بەندی بوون، تەنانەت ئەگەر دوژمنایەتیی کۆن و دێرینیشمان لە نێواندا هەبێت ئێمە هیچ جۆرە کارێکی وا ناکەین. چونکە لە هەموویان خۆش بووین و، تا دەتوانین هەوڵ دەدەین هەست و نەستی یەکتر زامدار نەکەین و دڵیان نەشکێنین. ئەمە بڕیارێکە بە ڕێنمایی قورئانی پیرۆز و فەرمانی برایەتیی ئیسلام و داخوازیی بەرژەوەندیی هەموومان دەرمان کردووە).

بەم جۆرە، "بەندیخانە" دەکەن بە "قوتابخانە"یەکی بەپیت و بەرەکەت.

پاشکۆی مەقامی دووهەمی وتەی سیازدەهەم:

# قورئانی پیرۆز دالّدە و شیفایە

ئەمەی خوارەوە ڕاستی‌یەکی فراوان و درێژە "شەوی قەدر" بە دلّمدا هات. وا هەولّ دەدەم زۆر بە پوختی بەم جۆرەی خوارەوە ئاماژەی بۆ بکەم:

یەکەم:

مرۆڤایەتی بە دەست ئەم جەنگە جیهانی‌یەی دواییەوە گەلێ ئازاری چەشت، چونکە دژوارترین جۆرەکانی ستەم و دڕندەترین چەشنەکانی خۆسەپاندنی بە چاوی خۆی بینی، لەگەلّ ئەو کاولکاری‌یە سامناکەی کە هەموو جێ‌یەکی سەرزەویی گرتەوە، چونکە سەدان کەسی بێ تاوان بە تاوانی یەك کەس دووچاری گیروگرفت و دەردیسەری بوون و، کەسانی بێ دەستیش کەوتنە بەدبەختی و نەبوونی‌یەکی تابلێی تالّەوە و، سەرکەوتووانیش تووشی ئەشکەنجەیەکی ویژدانیی سەخت بوون، چونکە دەزانن توانای چاککردنەوەی ئەو کاولکاری‌یانەیان نی‌یە کە ئەنجامیان داوە و، لە مەترسیی ئەوەشدان کە نەتوانن پارێزگاریی دەستەلاّتیان بکەن.

ئەو ڕاستی‌یەش بە تەواوی بۆ خەلّکی دەرکەوت کە ژیانی دنیا - بێ هیچ گومانێك - ژیانێکی کاتی و لەناوچووەو، زرق و برقەکانی شارستانێتیش بەنجکەر و لەخشتەبەرن و هیچ سوودێك بە مرۆڤ ناگەیەنن و، گرۆی مرۆڤایەتیش بە خوێنی ئەو دەست وەشاندنە بەهێزە سوور و خوێناوی بوو کە لە زاتی مرۆڤانە و ئامادەییە بەرزەکانی ناو سروشتی وەشێنران..

هەروەها شکست هێنان و لەتوپەت بوونـی "بێ ئاگـایی" و "گومڕایی" و "سروشـت"ی کـەڕ و بێ گیـانیش بـە شمشێری ئەڵماسیی قورئانی پیرۆز بـە ڕوونی بۆ هەموو خەڵکی دەرکـەوت و، ڕووە ڕاستەقینە چەپەڵ و ناشیرین و غەددارەکـەی سیاسـەتی نێودەوڵـەتانیش ئاشـکرا بـوو، کـە چڕتریـن و ئەستوورترین و فراوانـترین پـەردەی لەخشـتەبردن و گومڕایی کردنـە و، لـە هەموویان زیاتر خەڵکی دەخنکێنێت و "گیان"یشیان فریو دەدات.

کەواتـە پاش ڕوون بوونـەوەی ئەمانـە، بێ هیـچ گومـانێك، مرۆڤایـەتی بـە دوای "خۆشەویستی ڕاستەقینە"ی خۆیدا دەگەڕێت، کـە ژیـانی هەمیشـەیی و نەمرییە و، بە هەموو توانایەوە بۆی تێدەکۆشێت. وا لە بـاکوور و ڕۆژئـاوای جیهان و ئەمریکادا نیشانەکانی ئەمەی باسمان کرد دەرکەوتوون.

هـەروەها مرۆڤایـەتی بـە تـەواوی تێدەگـات ئـەم ژیانـەی دنیـای کـە بـە چەشنێکی "مـەجازی" خۆشـی دەوێـت و عاشـقیەتی، ژیـانێکی ناشـیرین و لەناوچووە. ئەو کاتە – بـێ هیـچ گومـانێك – بـە دوای ئـەو قورئانـە پیرۆزەدا دەگەڕێت کە هەزار و سێ سـەد و شـەست ساڵە لە هەموو چەرخێکدا سێ سـەد مليـۆن خزمـەتگوزار و قوتـابیی هەيـە و.. مليۆنـان کەسـی حـەقپەرو تەسـدیقی هەموو یەکێك لە فەرمانەکانی دەکەن و.. لـە هـەموو خولـەکێکدا ڕێزی شایانی خـۆی لـە دڵـی هـەزاران لەبەرکـەرانیدا دەگیرێت و.. ڕێنمـایی مرۆڤـایەتی دەکات بە زمـانی خۆیـان و، بـە شـێوازە خـاوەن ئیعجـازەکەشـی مژدەی ژیانی نەمری و بەختەوەریی هەمیشەییان دەداتێ و، بەم کارەشـی زامـە بەسوێ و قووڵەکانیان سارێژ دەکات. بەڵکو ئەم مژدەیەی بە هەزاران ئایـەتی بـەهێزی خـۆی دووپـات دەکاتـەوە، تەنانـەت دەیـان هـەزار جـاریش، چ بـە ڕاشـکاوی و چ بـە ئامـاژە بـۆکردن، ئـەم هەواڵـە ڕادەگەیـەنێت و، چـەندەها بەڵگەی گومان بڕ و ڕوون و چەسپاویشی لەسەر دەهێنێتەوە.

جا ئەگەر مرۆڤایەتی بە تەواوی ژیریی لە دەست نەدات و، قیامەتێکی ماددی یان مەعنەوی نەیەتە ڕێی، ئەوا بە حەتمی بە دوای قورئانی پیرۆزی خاوەن ئیعجازدا دەگەڕێت، وەك لە هەموو کیشوەرەکانی جیهان و دەوڵەتە مەزنەکان و سوید و نەرویج و فینلەندەدا ئەمە ڕووی دا و، هەروەها وەك ئەوەی کە چەندین وتاربێژ و قسەزانی بەناوبانگی ئینگلتەرا بۆ قبوولکردنی تێدەکۆشن و، کۆمەڵەیەکی گرنگی ئەمریکایش کە بە دوای ئاییني ڕاستەقینەدا عەودالە، لێی دەکۆڵێتەوە..

جا ئەمانەی کە باس کران، دوای تێگەیشتن لە ڕاستی‌یەکانی ئەو قورئانە، بێ هیچ گومانێك دەستی پێوە دەگرن و، بە گیان و هەناوی خۆیان لە دەوری کۆدەبنەوە. چونکە سەبارەت بە چارەسەری ئەم ڕاستی‌یە هیچ شتێك نی‌یە هاوچەشنی قورئانی پیرۆز بێت و لەمەولاش نابێت، بە هیچ جۆرێك ناگونجێ کە شتێکی تر هەبێت جێی ئەم موعجیزە مەزنە بگرێتەوە.

دووهەم:

"پەیامەکانی نوور" بە وێنەی شمشێرێکی ئەڵماس بە دەستی ئەم موعجیزە مەزنەوە، خزمەتگوزاریەکانی خۆیان بە ڕادەیەك دەرخست کە دوژمنە سەرسەختەکانیشی بە بەڵگە بەستەوە و ناچاری تەسلیم بوونی کردن. لەو ڕووەشەوە کە موعجیزەیەکی واتا پڕ لە ئیعجازەکانی قورئانن، لە بەردەم ئەم گەنجینەیەی قورئاندا ئەرك و فرمانی سەرشانی خۆیان بەجێ دەهێنن، بە ڕادەیەك کە دەتوانن دڵ و گیان و سەرجەم هەستەکانی مرۆڤ ڕووناك بکەنەوە و چارەسەری شیفابەخش بە هەریەکەیان ببەخشن.

ئەمەیشت بەلاوە سەیر نەبێت، چونکە ئەم پەیامانە کاری بانگەواز کردنیان بۆ قورئانی پیرۆز گرتووەتە ئەستۆ و، هەر تەنها لە قورئان لێشاوی فەڕ و بەرەکەت وەردەگرن و، قورئان تاقانە سەرچاوەیانە.

ئەم پەیامانە هەروەك بە تەواوی ئەركی سەرشانیان جێبەجێ دەكەن، لە هەمان كاتدا بەسەر پڕوپاگەندە چەپەڵ و ناڕەواكانی دوژمنانی پەیامەكاندا سەركەوتن و، كەللەڕەقترین زەندیقیان لەناو برد و، سەختترین قەڵاكانی گومڕاییشیان كە "سروشت"ە و پەنایان پێ دەبرد بە "پەیامی سروشت" لە بناغەدا هەڵتەكاند و داریان بەسەر بەردیەوە نەهێشت.. هەروەها بە "مەسەلەی شەشەمی بەری درەختی ئیمان" و، بەڵگەكانی یەكەم و دووهەم و سێهەم و هەشتەمی پەیامی "عەسای مووسا"یش لە مەیدانی زانستە نوێكان و چڕترین تاریكی‌یە خنكێنەرەكانی "بێ ئاگایی"دا، بێ ئاگاییان لەو گۆڕەدا نەهێشت و نووری تەوحیدیان تێدا ئاشكرا كرد.

ئا لێرەوە دەردەكەوێت كە پێویستە بۆ ئێمە - بۆ نەتەوەش گەلێ پێویستترە - لە چوارچێوە و سنووری توانا و لە هەموو جێیەكدا قوتابیانی نوور چەندین قوتابخانەی نووریی بچووك بكەنەوە، دوای ئەوەی كە دەوڵەت لەم كاتەدا دەرفەتی داوە بە كردنەوەی قوتابخانەی تایبەتی بۆ وتنەوەی ئایین[1]..

ڕاستە هەموو خوێنەرێكی "پەیامەكانی نوور" دەتوانێت سوودێك بۆ خۆی وەربگرێت. بەڵام ناتوانێت لە هەموو مەسەلەكانی بە تەواوی تێبگات، چونكە ئەو پەیامانە ڕوونكردنەوەی ڕاستی‌یەكانی ئیمانن، كەواتە وانەی زانستی و، خواناسی و، سرەوتی دڵ و، خواپەرستین، لە یەك كاتدا[2].

---

(١) چونكە قوتابخانە ئایینی‌یەكان لە توركیادا هەر لە سەرەتای ساڵەكانی بیستەوە تا ساڵی ١٩٥٠ز قەدەغە كرابوون. (وەرگێڕ)

(٢) تەنانەت گەر كەسێك هەبێت پێویستی بە "فێربوون" نەبێت، ئەوا بێ گومان هەر پێویستی بە پەرستش و، ناسینی خوای گەورە و، سرەوت و ئاسوودەیی دڵی هەیە. لەبەر ئەوە، پەیامەكانی نوور وانەیەكی پێویستن بۆ هەموو كەسێك. (دانەر)

ئەو ئەنجام و بەرهەمانەی کە دەگونجا بۆ ماوەی پێنج یان دە ساڵ لە قوتابخانە ئایینی‌یەکاندا دەست بکەوتنایە، ئێستا دەتوانرێت لە قوتابخانەکانی نووردا بە ماوەی پێنج یان دە حەفتە - بە ئیزنی خوا - دەست بکەون.

سوپاس بۆ خوای گەورە، لە ماوەی بیست ساڵی ڕابوردوودا ئەو ئەنجام و بەرهەمانەیان هێنایەدی.

ئنجا سوودی ئەم پەیامانە، کە بانگەوازکار و چەند بریسکانەوەیەکی ڕووناکی‌یە گەشەدارەکەی قورئانن، بۆ ژیانی نەتەوە و ئاسایشی نێو وڵات شتێکی سەلمێنراوە، تەنانەت بۆ ژیانی ڕامیاریش، چ جای ژیانی ئەودنیای.

کەواتە گەلێ پێویستە دەوڵەت بە نیازی خراپ دەستیان بۆ درێژ نەکات. بەڵکو بە لێبڕانەوە بۆ بڵاو کردنەوەیان تێبکۆشێت و، خەڵکی بۆ خوێندنەوەیان هان بدات. تاکو ئەم کارەی بکات بە کەفارەتی خراپکاری‌یە پێشووەکانی و، ببێت بە بەربەستێکی مەحکەم لە ڕووی ئەو بەڵا و گرفت و ئاشووب و تۆقاندنکاری و مەترسی‌یانەی کە لە داهاتوودا دێنەپێش.

ئومێدی حەوتەمی پەیامی پیران:

## ئیمان دڵدانەوەیە

کاتێ کە لە سەرەتای پیریمدا خەندەی خۆشحاڵیی "سەعیدی کۆن" نەما و جێی بۆ شین و گریانی "سەعیدی نوێ" چۆڵ کرد، دنیاخوازانی "ئەنقەرە" پێیان وابوو من وەك باری پێشووم ماومەتەوە و هەر "سەعیدی کۆن"ی جارانم، بۆیە بانگێشتیان بۆ کردم کە بچم بۆ ئەوێ. منیش ڕۆشتم[1].

لە ڕۆژێکی کۆتایی پایزدا ڕۆشتمە سەر لوتکەی قەڵاکەی ئەنقەرە، کە لە من گەلێ زیاتر دووچاری پیری و پرتوکان بووبوو!

لەوێ ئەو قەڵایەم وەك ڕووداوە مێژوویيە بەردبووەکان هاتە بەرچاو!

جا بەهۆی پیربوونی ساڵ لە وەرزی پایزدا و، پیریی خۆم و، پیریی قەڵاکە و، پیریی مرۆڤایەتی و، پیریی دەوڵەتی مەزنی عوسمانی و، مردنی خەلافەت و، پیربوونی دنیا بە گشتی، خەمێکی قووڵ، ناخی دەروونمی گرتەوە و تەزوویەکی بەتینیش بە جەستەمدا هات..

---

(١) ئەمەش لە ١٩٢٢/٩/٩دا بووە، لەم سەفەرەی ئەنقەرەدا و لە ڕۆژی ١٩٢٣/١/١٩دا بەیاننامەیەکی گرنگی بۆ ئەنجوومەنی نوێنەران (مەجلیسی مەبعووثان) نووسی کە (ژەنەراڵ کازم قەرەبەکر) لە ئەنجوومەنەکەدا خوێندیەوە و سەرەتاکەی بەم شێوەیە دەست پێدەکات: (یا أیـــها المبعوثون! إنكم لمبعوثون ليوم عظيم) لە ئەنجامی خوێندنەوەی ئەم وتارەدا نزیکەی (شەست نوێنەر) ڕێگای خواپەرستی و بەجێهێنانی فەرزەکانیان گرتەبەر، پاش ئەوەی ئەو دەوروبەرەی کە لە ئەنقەرەدا تێی کەوتبوون لە سەرچاوەی ئیمان دووری خستبوونەوە. هەر لەم سەفەرەی ئەنقەرەشدا پەیامی (حوباب)ی چاپ کرد، لە بەرامبەر ئەو لە خوا دوورییەی کە لە پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەدا بوو. (وەرگێڕ)

ئەو حاڵەتە، ناچاری کردم کە لەسەر لوتکەی ئەو قەڵایەوە چاو بەناو بەرزاییەکانی ئایندە و شیو و دۆڵەکانی ڕابوردوودا بگێڕم و، بە دوای نوور و ئومێد و شتێکی دڵخۆشکەردا بگەڕێم، تاکو شەوەزەنگی چڕ و تاریکی ئەو بارە ڕۆحی‌یەم بۆ ڕووناك بکاتەوە و، لە تاریکایی ئەو هەموو چەشنە پیری‌یە تێك ئاڵاوانەی دەوروبەرم، کە نوقمی بووە، دەری بهێنێت[٢]!

بۆ مەبەستی چاوگێڕان بە دوای نوور و ئومێددا، ئاوڕێکم بە لای ڕاستدا - کە ڕابوردووە - دایەوە. ئەم لایەم لە دوورەوە لە شێوەی گۆڕستانی باوك و باپیرانم و تێکڕای مرۆڤایەتیدا هاتە پێش‌چاو. واتە لە بریی ئەوەی دڵم بداتەوە و نوورێکم پێ ببەخشێت، کەچی ئەوەندەی تر بێزاری کردم و دڵی داگرتم!

پاشان ئاوڕم بە لای چەپدا دایەوە - کە ئایندەیە - بەو نیازەی دەرمانێکم تێدا دەست بکەوێت. کەچی ئەم لایەم لە شێوەی گۆڕستانێکی گەورە و تاریکی خۆم و هاوچەشنەکانم و نەوەکانی داهاتوودا بینی! بەم جۆرە، ئەم لایەش دەردەکەی گرانتر کردم!

دوای ئەوەی کە دڵم لە "ڕابوردوو" و "ئایندە" هەڵکەندرا، سەیرێکی کاتی "ئێستا"م کرد. یەکسەر لە بەرچاوی ڕوانینی مێژوویی‌مدا ئەم کاتەم لە شێوەی تابووتی تەرمی جەستەی تێکشکاوم و، بە وێنەی سەربڕاوێك لە نێوان ژیان و مردندا، هاتە پێش‌چاو!

کە دەستم لەم لایەش داشۆرد، سەرم بەرز کردەوە و بۆ چڵەپۆپەی درەختی تەمەنی خۆمم ڕوانی. بینیم تەنها یەك دانە بەری گرتووە، ئەویش تەرمەکەی خۆمە و بۆم دەڕوانێت!

---

(٢) ئەم حاڵەتە ڕۆحی‌یە لە شێوەی موناجاتدا، بە زمانی فارسی هاتە دڵمەوە و نووسیم، پاشان لە پەیامی (حوباب)دا لە ئەنقەرە چاپ کرا. (دانەر)

لەتاوا سەرم داخست و ڕوانیمە ڕەگ و ڕیشەی درەختی تەمەنم. بینیم خاك و گڵی ژێر پێم، تێکڕا گڵی جەستە و ئێسکی پرتووکاوی منن کە تێکەڵی یەکتری بوون و خەڵکی بەسەریاندا دەڕۆن و پێی پێدا دەنێن!

بەم شێوەیە، ئەم دوو ڕوانینەش، لە بریی ئەوەی دەرمانم بدەنێ و زامەکەم سارێژ بکەن، کەچی دەردەکەیان پتر بۆ گران کردم و هیچ دەرمانێکم تیایاندا بەدی نەکردا

لە ناچاریدا ئاوڕێکم بە لای "دوا"وە دایەوە. بینیم ئەم دنیا فانییە بەرەو شیو و دۆڵی بێهوودەیی و ڕووەو تاریکستانی "نەبوون" تلێر دەبێتەوە! ئەم سەیرکردنە، ژەهری بەسەر زامەکەمدا کرد و، لە بریی ئەوەی سارێژ و تیماری بکات پتر کولاندیەوە و هێنایەوە سۆ.

کە لەم لایەش نائومێد بووم، سەیرێکی "بەردەم"ی خۆمم کرد و ڕوانیمە دوور. دەبینم وا گۆڕەکەم لەسەر چەقی ڕێگادایە و دەمی لێ کردوومەتەوە و چاوەڕێم دەکات! لە پشتەوەیشی ئەو ڕێگا دوور و درێژە نەبڕاوەیە دەردەکەوێت کە چین لە دوای چینی کاروانەکانی گرۆی مرۆڤی پێدا تێپەڕ دەبن!

منیش لە بەردەم ئەم هەموو گیروگرفتە سەخت و سەرسووڕهێنەرانەی کە لە هەر شەش لامەوە ڕووم تێدەکەن، بینیم هیچ پاڵپشتێکم نییە کە پشتی پێ ببەستم و، جگە لە بەشێکی بچووکی ئەو ویستە هەندەکییە(الإرادة الجزئیـــة) نەبێت کە پێم بەخشراوە هیچ چەکێکی ترم بە دەستەوە نییە.

کەواتە لە بەردەم هەموو دوژمنانی زۆر و شتانی زیانبەخش و لە ژمارە نەهاتوودا تەنها ئەو چەکە مرۆڤانەیە نەبێت کە بریتییە لە (جوزئی ئیختیاری) هیچی تر شك نابەم. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم چەکەش لە خۆیدا کۆڵەوار و ناتەواوە و، ناتوانێت بڕواتە ناو کاتی "ڕابوردوو" تاکو خەم و خەفەتەکانی

ئەوێم نەهێڵێت و، بیشچێتە ناو "ئایندە"وە تاکو هەر شتێکی سامناك لە ڕێگامدایە لەناویان ببات، ئەوا دڵنیا بووم لەوەی کە نە دەستەڵاتی چارەسەرکردنی سەرجەمی ئازارەکانی خۆمم هەیە و، نە دەشتوانم گشت هیوا و ئاواتەکانی ڕابوردوو و داهاتووم بهێنمەدی. بۆیە لە ناچاریدا دەست لەئەژنۆ دانیشتم و دۆش دامام!

لەم کاتەدا کە لە هەر شەش لامەوە چەندین جۆری بێزاری و سەرسامی و نائومێدی و تاریکی دەورەیان دابووم، "نوورەکانی ئیمان"م بینی کە لە ڕووی قورئانی پیرۆزی خاوەن ئیعجازی بەیانەوە دەدرەوشانەوە! ئەم نوورانە بە هانامەوە هاتن و هەر شەش لاکانیان بە چەندین نووری درەخشان بۆ ڕووناك کردمەوە، بە چەشنێك کە ئەگەر ئەو بێزاری و تاریکییە زۆرانەی گەمارۆیان دابووم سەد جارەش بیوونایەتەوە، ئەو نوورانە سەروزیادی ڕووناککردنەوەی هەموویان دەبوون.

بەم جۆرە، ئەو نوورانەی ئیمان یەك بە یەکی ئەو زنجیرە سامناك و درێژانەی گۆڕی بە دڵدانەوە و ئومێد و، سەرجەمی مەترسییەکانیشی کرد بە هیوای گیان و ئارامی و ئاسوودەیی لە دڵ و دەروونداǃ

بەڵێ، "ئیمان" توانیی ئەو وێنە سامناکەی "ڕابوردوو" - کە گۆڕستانێکی گەورە بوو - بدڕێنێت و، بیگۆڕێت بە ئەنجومەنێکی نوورانیی و کۆگای خۆشەویستان. ئەمەشی بە "عین الیقین" تەنانەت بە "حق الیقین" پیشان دام..

هەروەها ئەو "داهاتوو"ەی کە کاتێ بە چاوی بێ ئاگاییەوە سەیری دەکەین وەکو گۆڕێکی گەورە و فراوان دێتە پێش چاومان، "ئیمان" بە "علم الیقین" پیشانی دام کە لە ڕاستیدا ئەنجومەنی میوانداریی خوای گەورەی میهرەبانە، کە لە کۆشکەکانی بەختیاریی هەمیشەییدا بۆ میوانەکانی خۆی ئامادەی کردووە..

پاشـــان "ئیمـــان" ئـەو دیمـەنی تـــابووت و تـەرمـــەی کـــاتی "ئێســـتا"ی تێکشـکاند و، تێی گـەیاندم کـە کـاتی ئێسـتام مەڵبـەندێکی بازرگانی‌یـە بـۆ دوارۆژ و میوانخانەیەکی ڕازاوەی خواییە..

ئنجا ئەو تاقە "بەر"ەی درەختی تەمەن، کـە چاوی بێ ئاگـایی لـە شێوەی "تەرم"دا پیشانی دام، دەرکەوت بـەو جۆرە نی‌یە. چونکە "ئیمـان" بـە "علـم الیقین" پیشانی دام کە ئەوە بریتی‌یـە لـە دەربـازبوونی "گیـان"م - کـە شیاوی ژیـانی هەمیشـەییە و دەستنیشـانکراوی بـەختیاریی هەتاهەتایـە - لـە هێلانـە کۆنەکەی خۆی بەرەو ژیـانی نـاو ئاسۆی ئەستێرەکان و گەشتوگوزار لــە ناویاندا..

پاشـــان ڕازە نهێنی‌یـەکانی "ئیمـــان" دەریانخســـت کـە خـاکی ئێســـکی پرتووکاوم و خاکی سەرەتای دروستبوونم بەو شێوە کەم نرخـە نی‌یـە کـە پێـی پێدا بنرێت، بەڵکو دەرگای میهرەبانیی خوای گـەورە و پەردەی سـەر ڕووی هۆڵەکانی بەهەشتە..

ئنجا کە یەکەم جار بـە چـاوی بێ ئاگـایی دەمڕوانی‌یـە حـاڵ و بارودۆخـە داڕووخاوەکـانی "دنیـا" وا دەهاتنـە پێـش چـــاوم کـــە لـــە شـــیو و دۆڵـــی بێهوودەییەوە بکەونە ناو تاریکایی "نەبوون"ەوە. کـەچی "ئیمـان" پیشـانی دام کـە ئـەم ئاڵوگۆڕانـەی دنیـا بریتـین لــە نامــە و نووسـراوە صەمەدانی‌یـەکانی خـواوەنـد و، لاپـەڕەکانی نەخشـونیگاری نـاوە جـوانەکانی، کـە ئـەرکی سـەرشـانیان ئـەنجام داوە و، واتاکـانی خـۆیان ڕاگـەیاندووە و، بەرهـەم و ئاکامی خۆیان لە بوونەوەردا بەجێ هێشتووە.

بەم جۆرە "ئیمان" هەتا پلەی "علم الیقین" بەها و چییەتی(ماهیة)ی دنیـای پێ ناساندم..

پاشان ئەو "گۆڕ"ەی کە لەوەو پێش وامدەزانی بۆم دەڕوانێت و، لەسەر چەقی ڕێگا لە مەلآسدایە و چاوەڕوانم دەکات، "ئیمان" بەهۆی نووری "قورئانی پیرۆز"ەوە دەری خست کە ئەو گۆڕە بیرێك نییە دەمی لێ پان کردبێتەوە، بەڵکو پیشانی دام کە ئەو گۆڕە لە ڕاستیدا بریتییە لە دەرگای چوونەژوورەوە بۆ ناو "جیهانی ڕووناکی". ئەو ڕێگا دوور و درێژەش بە تاریکایی و نەبوون کۆتایی پێ نایەت، بەڵکو ڕاستە شەقامێکە بەرەو جیهانی "ڕووناکی" و "بوون" و "بەختیاریی هەمیشەیی".

بەم جۆرە، ئەم حاڵەتانە بوون بە دەرمانی دەرد و مەڵهەمی زامەکانم. ئەمانەشم بە شێوەیەکی هێندە ئاشکرا بەدی کرد کە گەیاندمیانە قەناعەتێکی تەواو بەو ئەنجامانە.

پاشان ئەم "جوزئی ئیختیاری"یە کەمەی کە تەنها دەستکەوتێکی تابلێیت هەندەکیی هەیە، "ئیمان" بەڵگەنامەیەکی ئەوتۆی پێ بەخشی کە بەهۆیەوە پاڵ بە توانستێکی ڕەهاوە بداتەوە و، پەیوەندیی بە میهرەبانییەکی فراوانیشەوە بکات لە دژی ئەو هەموو دوژمنە لەژمارەبەدەر و تاریکییە زۆرانەی کە لە هەموو لایەکەوە دەورەیان داوە. تەنانەت هەر خودی "ئیمان" دەبێت بە بروانامەیەك بە دەست "جوزئی ئیختیاری"یەوە.

ئنجا هەرچەندەش ئەم جوزئە ئیختیارییە - کە چەکی مرۆڤە - خۆی لە خۆیدا کۆڵەوار و، کەم و، کۆتا و، ناتەواوە، بەڵام ئەگەر بە ناوی خواوەندی حەق و لە پێناوی خوا و لە ڕێگای ئەودا بەکارهێنرا، ئەوا بە ناوی ئیمانەوە بەهەشتێکی هەمیشەیی و فراوان بە پانتایی پێنج سەد ساڵ ڕێ دەستی خاوەنەکەی دەخات..

ئیماندار لەمەدا وەك ئەو سەربازە وایە کە ئەگەر هێزە هەندەکییەکەی خۆی بە ناوی دەوڵەتەوە بەکار بهێنێت، دەتوانێت بە ئاسانی چەند کارێکی

ئەوتۆ ئەنجام بدات کە بە هەزاران جار لە هێزە تایبەتی‌یەکەی خۆی گەورەتر بێت.

ئنجا هەروەك "ئیمان" بەڵگەنامەیەك بە دەستی "جوزئی ئیختیاری" دەسپێرێت، لە هەمان کاتدا جڵەوی جوزئی ئیختیاریش لە دەست "جەستە" دەسێنێتەوە کە هیچ دەستەڵاتێکی بەسەر ئاینده وڕابوردوودا نی‌یە و، دەیداتە دەست "دڵ" و "گیان"!

جا لەبەر ئەوەی بازنەی "دڵ" و "گیان" بە وێنەی جەستە پابەندی "کاتی ئێستا" نی‌یە و، چەند ساڵێکی ئاینده وڕابوردووش لە سنووری بازنەی ژیانی دڵ و گیاندان، ئەوا ئەم جوزئە ئیختیاری‌یە لە هەندەکی‌یەوە دەردەچێت و دەبێت بە هەمەکی! ئیتر هەروەك بە "هێزی ئیمان" دەڕواتە ناو قووڵایی شیو و دۆڵەکانی "ڕابوردوو" و تاریکیی خەم و خەفەتەکانی ئەوێ لەناو دەبات، بە هەمان جۆر و بە "نووری ئیمان" سەردەکەوێت و دەفڕێت تا دەگاتە لوتکەی بەرزاییەکانی "ئاینده"ش و هەموو مەترسی‌یەکانی تێدا لەناو دەبات!

بەڵێ، ئەی خوشك و برایانی پیرم و ئەی ئەو کەسانەی کە دەردیسەریی پیری ئازاریان دەدات!

سوپاس بۆ خوا! مادەم ئێمە لە ئیمانداراانین و، ئەم ئیمانەش گەنجینەی شیرین و، ڕووناکی و، خۆشەویستیی تا ئەم ڕادەیەی تێدایە..

مادەم ئەم پیری‌یەشمان زیاتر دەستمان دەگرێت و دەمانباتە بەردەرگای ئەو گەنجینانە..

ئەوا دەبێ هەزاران شوکر و ستایش پێشکەش بە خوای گەورە بکەین لەسەر ئەم پیری‌یەی کە ڕووناکیی "ئیمان"ی ئاراستە کراوە!

## بێداربوونەوەی دڵ

ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە چەند تاڵێکی سپی - کە نیشانەی پیری‌یە - تێکەڵی مووی سەرم بووبوون.

ڕووداوە سەختەکانی یەکەم جەنگی جیهانی و، ئاسەوارە قووڵەکانی دیل بوونم لە ڕووسیا[1] بە سەر ژیانمەوە، خەوی بێ ئاگایی منیان قورستر کردبوو..

دوای ئەوەش کە لە دیلی دەرباز بووم و گەڕامەوە بۆ ئەستەمبووڵ، ئەو پێشوازی‌یە ڕەنگین و گەرمەی لێم کرا، چ لە لایەن خەلیفە و چ لە لایەن "شێخولئیسلام" و چ لە لایەن سەرکردەی گشتی و چ لە لایەن قوتابیانی زانستە شەرعی‌یەکانەوە، هەروەها ئەو ڕێزلێگرتنە گرنگەی کە لە ڕادەیەکدا بوو من شایستەی نەبووم..

هەموو ئەمانە، هاودەم لەگەڵ مەستی و بێ ئاگایی لاویدا، بوون بەهۆی دروستبوونی بارێکی ڕۆحیی ئەوتۆ کە خەوی بێ ئاگایی منیان لە جاران قورستر کرد، بە ڕادەیەك کە دنیام بە هەمیشەیی دەهاتە بەرچاو! هەروەك "دەروون"یشم هێندە بە شێوەیەکی سەیر خۆی پابەندی دنیا کردبوو وەك بڵێی هەرگیز مردنی لە ڕێگادا نەبێت!

---

(١) مامۆستا نوورسی لە ١٩١٦/٢/١٩دا لە بەرەی قەفقاز لە کاتی بەرگری کردن لە شاری (بەدلیس) بە دیل گیرا. لەو کاتەدا مامۆستا سەرکردەی "تیپەکانی یاریدەدەران" بووە، کە لە قوتابی‌یەکانی و لە خۆبەخشەران پێکهاتبوون. پاشان چاودێریی خوا هات بە هانایەوە و لەو دیلی‌یە ڕزگاری بوو، ئەوەبوو لە ١٩١٨/٦/١٥ گەڕایەوە بۆ ئەستەمبووڵ. (وەرگێڕ)

ئا لەم کاتە و لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا سەرێکی مزگەوتی "بایەزید"م دا لە ئەستەمبووڵ، بەو نیازەی کە لەسەر زاری قورئان خوێنە دڵسۆزەکانی ئەوێ گوێ لە قورئانی پیرۆز ڕابگرم. ئەوەبوو لەسەر زمانی قورئان خوێنەکانەوە ئەو ڕاگەیاندنە توند و بەهێزەی قورئانی پیرۆزی ئیعجازبەخشم بیست کە بە گوفتارە بەرز و ئاسمانی‌یەکەی خۆی مردن و نەمانی مرۆڤ و هەموو زیندەوەرێکی لە ئایەتی: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذائِقَةُ الْمَوْتِ﴾دا (آل عمران:١٨٥) بە ئاشکرا ڕاگەیاندووە!

ئەم ڕاگەیاندنە توند و بەهێزە، هێندە بە گەرموگوڕی ڕۆشتە ناو گوێمەوە کە هەموو چینە چڕ و ئەستوورەکانی خەوی بێ ئاگایی و مەستیی منی بڕی و جێی خۆی لە ناخی دڵمدا کردەوە!

دوای ئەوە، لە مزگەوت دەرچووم.

پاش چەند ڕۆژێك هەستم کرد کە پاشماوەی ئاسەوارەکانی ئەو خەوی بێ ئاگاییەی کە لە مێژە جێی خۆی لە ناخی مندا کردبووەوە، وەك زریانێکی گەورە و سەخت لە سەرمدا دەجوولاَ و، خۆم وەك کەشتی‌یەك دەبینی کە لە ناو شەپۆلی دەریادا قیبلەنماکەی بە ڕاست و چەپدا بخولێتەوە و لە کار کەوتبێت. دەروونم لەناو ئاگرێکی چەڕە دووکەڵاویدا هەڵدەقرچا.

خۆ هەر کات لە ئاوێنەدا سەیری خۆمم دەکرد، مووە سپی‌یەکان پێیان دەوتم: وریابە!!

بەڵێ، ئەم جارە بە پەیدا بوون و بێدارکردنەوەکانی ئەو چەند تاڵە سپی‌یە هەموو شتێکم لە لا ڕوون بووەوە. چونکە بینیم ئەو لاوی‌یەی کە من زۆر جار پێی دەنازیم و شەیدای چێژەکانی بووبووم، ئێستا پێم دەڵێ: "خوا حافیز"!

هەروەها ئەو ژیانەش کە پەیوەندیی خۆشەویستیم لەگەڵدا بەستبوو، وردە وردە بەرەو کزبوون و کوژانەوە دەڕۆشت. ئەو دنیایەش کە دەستم لە داوێنی گیر کردبوو، تەنانەت زۆریش بۆی پەرۆش بووم، بگرە شەیداشی بووبووم، بینیم پێم دەڵێت: "خوا حافیز، خوات لەگەڵ"! بەمەش پێی ڕادەگەیاندم کە من لێرەدا میوانم و هێندەی نەماوە ئەم میوانخانەیە بەجێ بهێڵم..

بەڵکو لەمەش زیاترم دی؛ چونکە بینیم دنیا خۆیشی خەریکی خۆپێچانەوەیە بۆ کۆچکردن و "خواحافیزی" وتن!

ئنجا یەکێ لە واتا هەمەکی‌یەکانی ئایەتی: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ﴾ لە ڕووی دڵمدا کرایەوە، کە بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

(سەرجەمی مرۆڤایەتی بە گشتی وەك تاقە کەسێك وایە، دەبێ بمرێت تاکو سەرلەنوێ زیندوو بکرێتەوە.. گۆی زەویش کەسێکە دەبێ تامی مردن بچێژێت تاکو شێوەی مانەوە و هەمیشەیی لەخۆ بگرێت.. دنیاش بە هەمان جۆر کەسێکی ترە و دەبێ بمرێت، تاکو لە شێوەی دواڕۆژدا دروست بکرێتەوە).

ئنجا بیرم لەو بارە کردەوە کە ئەو کاتە منی تێدابووم. بینیم:

ئەو لاوی‌یەی کە خولگەی هەموو تام و چێژێکە، بەرەو نەمان دەڕوات و شوێن بۆ ئەو پیری‌یە چۆڵ دەکات کە سەرچاوەی هەموو داخ و خەفەتێکە!

ئەم ژیانە درەخشان و ڕووناکەش لە ڕۆشتندایە و، مردنی بە ڕواڵەت تاریك و لێڵ خۆی بۆ شوێنەکەی ئامادە دەکات!

ئەم دنیا خۆشەویست و شیرینەش کە وا دەزانرێت هەمیشەیی‌یە و خۆشەویستی بێ ئاگایانە، بینیم زۆر بە پەلە بەرەو ئاوابوون دەڕوات!

منیش بۆ ئەوەی سەر بە ناو بێ ئاگاییدا بکەم و لە دەست ئەو بارە پەرێشانە خۆم بخەڵەتێنم، ئاوڕێکم بە لای ئەو پلە و پایە بەرزە کۆمەڵایەتی‌یەدا

دایەوە کە پاش گەڕانەوەم لە دیلی لە ئەستەمبووڵ بەدەستم هێنا و، دەروونم پێی خەڵەتا و، سەرتاپا دڵنەوایی و ڕێزلێنان و ڕووتێکردنی خەڵکی بوو بەرامبەرم و، زۆر لە توانا و وزەی خۆیشم زیاتر بوو.. بینیم هەموو ئەمانە تا دەرگای گۆڕەکەم لەگەڵمدا دێن کە لێی نزیك بوومەتەوە و، هەر هێندەی گەیشتمە ئەوێ سەرجەم ڕووناکی‌یەکانیان دەکوژێنەوە!

پاشان بۆم دەرکەوت کە ڕیایەکی قەبە و، خۆپەرستی‌یەکی سارد و سڕ و، بێ ئاگایی‌یەکی کاتی، خۆیان لە پشتی پەردەی ڕازاوە و نەخشاوی "لەخۆ ڕازی بوون"ەوە مەڵاس داوە، کە نموونەی بەرز و ئاواتی گەورەی شەیدایانی ناوبانگە!

ئیتر تێگەیشتم کە ئەم شتانەی تا ئێستا منیان خەڵەتاند، لەمەودوا هیچ دڵنەوایی و ڕووناکی‌یەکم پێ نابەخشن.

جا بۆ ئەوەی ئەم جارەیان بە تەواوی لە خەوی بێ ئاگایی بێدار ببمەوە، دەستم کردەوە بە گوێ ڕاگرتن لەو قورئان خوێنە بەڕێزانەی ناو مزگەوتی "بایەزید" بۆ مەبەستی خوێندن و وەرگرتنی وانە ئاسمانی‌یەکەی قورئانی پیرۆز. ئیتر لەم ڕێیەوە و لە ناوەندی فەرمانە خاوێن و پیرۆزەکانی پەروەردگاردا مزگێنی‌یەکانی ئەو ڕابەرە ئاسمانی‌یەم بیست کە لە ئایەتی: ﴿وَبَشِّرِ الذينَ آمَنُوا...﴾دا (سورة البقرة:٢٥) ڕایگەیاندووە.

بەڵێ، کاریگەریی ئەو ڕێژنە و بەرەکەتەی لە قورئانی پیرۆزەوە دەستم کەوت، هانی دام کە لە ناو ئەو شتانەی سەرسامیان کردبووم و خستبوومیانە نائومێدی و دڵتەنگی‌یەوە، بە شوێن ئومێد و ڕووناکیدا بگەڕێم.

هەزاران شوکر و ستایش بۆ بەدیهێنەری بەخشندەم کە یارمەتیی دام بۆ دۆزینەوەی دەرمان لە هەمان نەخۆشیدا و.. بینینی ڕووناکی لە هەمان تاریکیدا و.. هەست کردن بە دڵنەوایی لە هەمان ئازار و سامناکیدا!

یەکەم جار سەیرێکی ئەو "ڕوو"ەم کرد کە خەڵکی دەترسێنێت و لە پێش چاوی هەمواندا سامناك دەردەکەوێت، کە بریتی‌یە لە ڕووی "مردن"!

بە نووری قورئانی پیرۆز بۆم دەرکەوت کە ڕووی ڕاستەقینەی "مردن" سەبارەت بە ئیماندارانەوە ڕوویەکی جوانی ڕووناکە، هەرچەند دیوی دەرەوەی بە پەردەیەکی ڕەشی تاریك و ناشیرین و ترسناك داپۆشراوە.

ئەم ڕاستی‌یەشمان بە جۆرێکی گومان بڕ لە زۆر پەیامدا چەسپاندووە. بە تایبەت لە "وتەی هەشتەم" و "مەکتووبی بیستەم"دا ڕوونمان کردووەتەوە کە:

"مردن" لەناودانی هەتاهەتایی و جودایی هەمیشەیی نی‌یە، بەڵکو پێشەکی و سەرەتای ژیانێکی هەمیشەییە و.. مۆڵەت و حەوانەوەیە و.. کۆتایی هێنانە بە ئەرکی کارمەندیی ئەم ژیانە و.. شوێن گۆڕین و بە یەك شادبوونەوەیە لەگەڵ کاروانی ئەو خۆشەویستانەی کە کۆچیان بۆ جیهانی بەرزەخ کردووە.

بەم جۆرە و لە ڕوانگەی ئەم ڕاستی‌یانەوە، ڕووی گەش و ڕووناکی مردنم دی. بێ گومان نەك بە ترس و لەرزەوە، بەڵکو - لە ڕوویەکەوە - بە ڕوانینی حەز و تاسەمەندی‌یەوە بۆم ڕوانی. کە ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی یەکێك لە نهێنی‌یەکانی یادی مردن(رابطـة الموت)م بۆ دەربکەوێت کە ڕێڕەوانی ڕێبازەکانی "تەسەووف" ئەنجامی دەدەن.

پاشان سەرنجی "سەردەمی لاوی"م دا کە سەردەمێکە هەموو کەسێك شەیدایەتی و خەفەت بە نەمانی دەخوات و، وەکو لاویی من، لە هەموو کەسێکی تریش بە بێ ئاگایی و گوناهباری دەچێتەسەر!

بینیم لە پشت ئەو بەرگە ڕازاوە نەخشاوەی لاوی‌یەوە ڕوویەکی ناشیرین و تەنانەت سەرسووڕهێن و مەستکەر هەیە کە بەو بەرگە داپۆشراوە. خۆ ئەگەر من ڕاستی و چییەتیی لاویم نەزانیبایە، ئەوا با تەمەنێکی سەد

ساڵیشم ببوایە، ئەوا تا دوا هەناسەی ژیانم دووچاری خەفەت و گریانی دەکردم، بۆ ئەو چەند ساڵە کەمەی کە بە مەستی و پێکەنینەوە دەچێتە سەر. بە وێنەی ئەو شاعیرەی کە بە خەفەت و ئازارێکی تاڵەوە بۆ لاویی خۆی گریاوە و وتوویەتی:

ألا ليتَ الشبابَ يعودُ يوماً فأُخبِرَهُ بما فَعَلَ المشيبُ[٢]

بەڵێ، ئەو پیرانەی کە بە جوانی لە نهێنییەکانی تافی "لاوی" نەگەیشتوون، بە وێنەی ئەم شاعیرە، تەمەنی پیرییان بە خەفەت و گریانەوە دەبەنە سەر، بۆ لەدەستچوونی "سەردەمی لاوی"یان!

ئەگەر گەشە و لێهاتوویی هەرەتی "لاوی" لە باوەڕدارێکی هێمن و ژیر و دڵ بێدار و بە ویقاردا جێی خۆی بکاتەوە، وزە و هێزی لاوی لە خواپەرستی و کردەوەی چاك و بازرگانیی دواڕۆژدا بەسەر بیات، ئەوا دەبێت بە گەورەترین هێزی خێر و چاکە و، باشترین هۆی بازرگانی و، جوانترین و بەتامترین مایەی چاکەکاری.

بەڵێ، سەردەمی لاوی، سەردەمێکی گەلێ بەنرخە و نیعمەتێکی گەورەی خوایی و شادمانییەکی بەتام و خۆشە، بۆ کەسێك کە باش بەکاری بهێنێت و ئەرکە ئایینییەکانی سەرشانی جێبەجێ بکات.

بەڵام ئەگەر سەردەمی لاوی ڕێگای ڕاستی تێدا نەگیرێتە بەر و، لەگەڵ داوێن پاکی و خواپەرستیدا هاودەم نەبێت، ئەوا گەلێ مەترسیی سەخت و لەناودەری لە ڕێگادایە. چونکە هاندان و هەڵەشەیی ئەم سەردەمەی تەمەن

---

(٢) کورد لە واتای ئەم بەیتە شیعرە عەرەبییەدا وتوویەتی:

خۆزگا گەنجییەکەم ئەگەڕا دواوە گلەیی پیریم ئەکرد بەلاوە

(وەرگێڕ)

"بەختیاریی هەمیشـەیی" و "ژیـانی دوارۆژی" مرۆڤ لـەناو دەبات، تەنانەت لەوانەیە ژیانی ئەم دنیاشی تێکبشکێنێت. کە ئەمەش دەبێت بەهۆی لـەوەی لـە سەردەمی پیریدا خەفەت و ئازارێکی زۆر دەرخواردی ئەو کەسە بدات، تەنها لەبەر چەند ساڵێکی کەم کە بە کەیف و شادیەوە لێی چووەتەسەر.

جـا لـەبـەر ئـەوەی زۆربـەی خـەڵکی سـەردەمی لاوییان بـە بێ زیـان لـێ ناچێتـە سـەر، ئـەوا دەبـێ ئێمـەی پیر و بەسـاڵاچوو سوپاسـێکی زۆری خـوای خۆمان بکەین کە لە زیان و مەترسییەکانی ئەو سەردەمە ڕزگاری کردووین.

لە لایەکی تریشەوە تام و لەزەتەکانی "لاوی" - وەك هەموو شـتێکی تـر - لـە ئەنجامـدا دەبڕێنـەوە و کـۆتاییان پـێ دێـت. جـا ئەگـەر ئـەم سـەردەمە بـە پەرستش و کردەوەی چاك بەسەر ببرێت، ئەوا بەروبوومی نەبڕاوە و بـەردەوام بە مرۆڤ دەبەخشێت و، دەبێت بەهۆی دەستخستنی لاوێتییەکی هەتاهـەتایی لە ژیانێکی هەمیشەییدا.

* * *

پاشان سەیرێکی ئەم دنیایەم کرد کە زۆربەی خـەڵکی شـەیدا و گیرۆدەی بوون. بەهۆی نووری قورئانی پیرۆزەوە بینیـم (سـێ) دنیـای گشـتی هەیـە کـە تێهەڵکێشی یەکتری بوون:

یەکەم:

ئەو دنیایەی کە دەڕوانێتە نـاوە جوانـەکانی خـوای گـەورە و ئاوێنـەی ئـەو ناوانەیە.

دووهەم:

ئـەو دنیایـەی کـە دەڕوانێتـە ڕۆژی دوایـی و کێڵگـەی چـاندنی تـۆوی ئەودنیایە.

سێهەم:

ئەو دنیایەی کە دەڕوانێتە ئەهلی دنیا و گومڕایان و، جێی گاڵتە و گەپ و ڕابواردنیانە.

هەروەها بۆم دەرکەوت کە هەرچی کەسە لە ناوەندی ئەم دنیایەدا دنیایەکی گەورە و تایبەتیی خۆی هەیە. واتە هێندەی ژمارەی مرۆڤ دنیای تێهەڵکێشی یەکتری هەیە. بەڵام دنیای تایبەتیی هەموو کەسێك لەسەر بناغەی ژیانە تایبەتی‌یەکەی ئەو کەسە ڕاگیر بووە و، هەر کات جەستەی ئەو کەسە ڕووخا و تێکشکا، ئەوا دنیاکەی ڕووخاوە و قیامەتی بەرپا بووە.

جا لەبەر ئەوەی بێ ئاگایان بەم خێرایی و کتوپڕی‌یە هەست بە ڕووخانی دنیا تایبەتی‌یەکەی خۆیان ناکەن، کە ئاوا بە زوویی هەرەس دەهێنێت و کۆتایی پێ دێت، ئەوا شەیدای دەبن و پێیان وایە کە وەك دنیا دامەزراوە گشتی‌یەکەی دەوروبەریان وایە!

منیش کە بیرم کردەوە، لەبەر خۆمەوە وتم:

بێ گومان منیش - وەکو خەڵکی - دنیایەکی تایبەتیی خۆم هەیە و، دنیاکەی منیش وەکو هی ئەوان بە خێرایی و لە پڕ دەڕووخێت. ئیتر دەبێ چ سوودێك لە دنیا تایبەتی‌یەکەی تەمەنە کورتەکەمدا ببێت؟!

بە نووری قورئانی پیرۆز بۆم دەرکەوت کە ئەم دنیا تایبەتی‌یەی من و خەڵکی:

خانەیەکی کاتی‌یە بۆ بازرگانی و..

میوانخانەیەکە هەموو ڕۆژێك لە میوان پڕ دەبێت و پاشان خالی دەبێتەوە و..

بازاڕێکی سەر ڕێگایە بۆ ئەوانەی کە دێن و دەڕۆن و..

کتێبێکی کراوەی بەدیهێنەری وێنەکێشە کە دانستی خوای گەورە نووسین و کوژاندنەوەی بە ویستی خۆی تێدا دەکات و..

هەموو بەهارێکیشی نامەیەکی نەخشاوی ڕازاوەیە و..

هاوینەکانیشی چامەیەکی هۆنراوەی بەسۆز و ڕەنگینە و..

چەند ئاوێنەیەکی هەمیشە نوێ بووی ئەوتۆیە کە درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی کردگاری شکۆمەندیان تێدا دەردەکەوێت و..

باخچە و کێڵگەی تێدا چاندنی تۆوی ئەودنیایە و..

گوڵدانی میهرەبانیی خواوەندە و..

کارگەیەکی کاتییە بۆ ئامادەکردنی ئەو تابلۆ پەروەردگارییە هەمیشەییانەی کە لە جیهانی هەتاهەتایی و نەمریدا پیشان دەدرێن.

ئیتر منیش، کە ئەممم بینی، لە لایەنی خۆمەوە شوکرانەی زۆرم پێشکەشی خواوەندی بەدیهێنەری بەخشندەم کرد بۆ ئەوەی کە دنیای لەسەر ئەم شێوەیە بەدی هێناوە!

بەڵام ئەو "خۆشەویستی"یەی کە بۆ ئەوە لە ناخی مرۆڤدا جێگیر کراوە تاکو بۆ دوو ڕووە جوانەکەی دنیا بەکاری بهێنێت، کە دەڕواننە ناوە "جوانەکانی خوای گەورە" و "ڕۆژی دوایی" کەچی مرۆڤ نیشانەکەی نەپێکا و بە هەڵەدا چوو کاتێ کە ئەو خۆشەویستییەی لە جێگای خۆیدا بەکار نەهێنا و، بەرەو ڕووە ناشیرینە زیانبەخشەکەی سێهەمی دنیا وەری چەرخاند. بۆیە فەرموودە پیرۆزەکەی پێغەمبەری ئازیزی ﷺ تێدا هاتەدی کە دەفەرموێ:

"حب الدنيا رأس كل خطيئة"[٣].

---

(٣) رواه البيهقي في الشعب باسناد حسن إلى الحسن البصري رفعه مرسلاً، وذكره الديلمي في الفردوس، ورواه البيهقي أيضاً في الزهد وأبونعيم من قول عيسى بن مريم، وآخرون يعدونه من كلام ابن مسعود أو جندب البجلي رضي الله عنهم. بڕوانە: (كشف الخفاء:١٠٩٩)، (ضعيف الجامع الصغير وزيادته: ٢٦٨١). (وەرگێڕ – لە چاپە عەرەبییەکەوە)

جا ئەی خوشك و برایانی پیرم!

من بەهۆی نووری قورئان و یادخستنەوەی پیری و ئەو ڕووناکی‌یەی کە ئیمان بە دڵی منی بەخشی، ئەم "ڕاستی"یەم بینی، کە بە چەندین بەڵگەی گومانبڕ و سەلمێنەریش لە گەڵێ پەیامدا چەسپاندوومە. ئیتر هەستم کرد کە ئاسوودەیی و دڵنەوایی ڕاستەقینە و ئومێدی بەهێز و ڕووناکیی درەخشان سەبارەت بە من هەر تەنها لەو ڕاستی‌یەدایە. بۆیە بە هاتنی پیری و بەسەرچوونی سەردەمی لاویم، ڕازی و دڵخۆش بووم!

دەسا ئێوەش – ئەی خوشك و برایانی پیرم! – لەدەست پیری مەگرین و پێی دڵگران مەبن. بەڵکو هەمیشە لە شوکر و سوپاسی خوای گەورەدا بن. چونکە مادەم ئێوە ئیماندارن و، "ڕاستی"ش بەو جۆرە دەدوێت کە باسمان کرد، ئەوا با گریان و پەژارە هەر بەشی گومڕایان و بێ ئاگایان بێت، نەك هی ئێمە.

مەسەلەی شەشەمی بەری درەختی ئیمان:

## زانستەکان بەدیهێنەرمان پێ دەناسێنن

(ئەم مەسەلەیە ئاماژەیەکی کورتە بۆ تەنها یەك بەڵگە لە نێوان هەزاران بەڵگەی گشتیدا سەبارەت بە (ئیمان بە خوا) کە لە زۆر شوێنی تری پەیامەکانی نووردا بە بەڵگەی چەسپێنەرەوە ڕوون کراونەتەوە).

کۆمەڵێك لە قوتابیانی قۆناغی ئامادەیی لە شاری "قەستەمۆنی"[1] هاتن بۆلام و پێیان وتم:

– (خوای بەدیهێنەرمان پێ بناسێنە، چونکە مامۆستاکانمان باسی خوامان بۆ ناکەن)!

پێم وتن:

– هەریەك لەو زانستانەی دەیانخوێنن، هەمیشە باسی خوا دەکات و بە زمانی تایبەتیی خۆی خواوەندی بەخشندەمان پێ دەناسێنێت. کەواتە ئێوەش لە بریی مامۆستاکان گوێ بۆ زانستەکان ڕابگرن!

❖ بۆ نموونە:

هەروەك هەر شووشە دەرمان و پێکهاتەیەکی کیمیایی ناو دەرمانخانەیەکی گەورە، کە بە چەندین تەرازووی سەرنەکەر و ئەندازەی ورد

---

(١) "قەستەمۆنی" شارێکە دەکەوێتە باکووری تورکیا، لە ساڵی ١٩٣٧زدا مامۆستا نوورسی بۆ ئەوێ دوور خراوەتەوە و هەتا ساڵی ١٩٤٣ز تیایدا دەست بەسەر بووە، ئنجا لەم بەروارەوە بەندکراوی براوە بۆ دادگای گەورەی جەزا لە شاری "دەنیزلی". (وەرگێڕ)

ئاوێتـەی یـەکتر کرابێـتن، دەیچەسـپێنێت کـە دەرمانگـەرێکی دانـا و کیمیاگەرێکی زانا ئەم کارانەی ئەنجام داوە..

دەرمانخانەی گۆی زەویـش، کـە چـوار سـەد هـەزار جـۆری ڕووەك و زیندەوەری زیاتر تێدایە، بە هەمان جۆرە.. چونکـە لـە ڕاستیدا هەریەکە لـەو ڕووەك و زیندەوەرانـە وەك شووشـەیەکی پـڕ لـە پێکـهاتووی ورد و، ئاوێتەکراوێکی زیندەکاری سەرسووڕهێنەر وایە.

جا ئەم دەرمانخانە گەورەیە، خواوەنـدی دانـا و شـکۆمەند پیشـانی هـەموو کەسـێك، تەنانـەت نابینایـانیش، دەدات و، بـە ئـەندازەی پلـەی کـەماڵ و ڕێکوپێکـی و گەورەییەکـەی، بەدیهێنـەری بەخشـندە بـە غـەیری خـۆی دەناسێنێت، بە چەشنی دەرمانخانەکەی بازاڕ، کـە کیمیاگـەر و دروستکەری خۆی ناساند. ئەمەش بەپێی زانستی "پزیشکی" کە خۆتان دەیخوێنن.

❖ نموونەیەکی تر:

هەروەك ئەگەر کارگەیەکی گەورە و نائاسایی لـە تەنـها ماددەیـەکی زۆر ساکار چەندین جۆر کووتاڵی جۆراوجۆر بچنێت و بەرهەمیان بهێنێت، ئـەوا بەم کارەی دەیچەسپێنێت کـە بێ هیـچ گومـانێك ئەندازیارێکی میکـانیکیی کارامـە هەیـە ئـەم کارانـە ڕادەپـەڕێنێت. بـەم جـۆرە ئـەو کارگەیـە ئەندازیارەکەمان پێ دەناسێنێت.

ئەم مەکینە هاتوچۆکەر و کارگە خواییەش، کە نـاوی گـۆی زەوی‌یـە، بـە هەمان چەشنە، کە سـەدان هـەزار کارگـەی سـەرەکیی تێدایـە و هەریـەك لـەم کارگـە سـەرەکی‌یانـەش هـەزار کارگـەی وردەکـاری تێدایـە و، هەریەکـەیان - بـێ هیـچ گومـانێك - خـاوەن و بەدیهێنـەری خۆیمـان، بـە ئـەندازەی گـەورەیی و کـەماڵی ئەم کارگـە خواییـە لـەچاو کارگـە ئادەمی‌یەکـەدا، پێ

دەناسێنێت، هەروەك کارگە ئادەمی‌یەکە ئەندازیاری خۆی پێ ناساندین.
ئەمەش بەپێی دەستوورەکانی زانستی "میکانیك" کە دەیخوێنن.

❖ نموونەیەکی تر:

هەروەك کۆگا و گەنجینەیەکی گەورەی ئازووقە، کە لە هەموو لایەکەوە هەزار جۆر خواردەمەنیی تێدا ئامادە کرابێت و لەیەك جیا کرابنەوە و هەریەکەیان لە جێگایەکی تایبەتیدا ڕیز کرابن، تێمان دەگەیەنێت کە خاوەن و بەڕێوەبەرێکی هەیە سەرپەرشتیی دەکات..

ئەم گەنجینەی ڕۆزیدانە خوایی‌یەش بە هەمان جۆرە..

ئەم گەنجینەیەی کە لە گەشتی یەك ساڵیدا ماوەی بیست و چوار هەزار ساڵ ڕێ بەوپەڕی ڕێکوپێکی دەبڕێت و، سەدان هەزار بەدیهێنراوی لەناودا هەن کە هەریەکەیان پێویستی بە جۆرێك خواردەمەنیی تایبەتی هەیە..

ئەم گەنجینەیەی کە بەسەر هەر چوار وەرزەکەدا تێپەڕ دەبێت و، وەرزی بەهار وەك کاروانێك کە هەزاران جۆر خواردەمەنیی پێ بێت، لەگەڵ خۆیدا بۆ هەموو ئەو هەژارانە دەهێنێت کە لە زستاندا خۆراك و ئازووقەیان لێ براوە..

ئەم گەنجینە خوایی‌یە (کە گۆی زەوی‌یە) وەك کەشتی‌یەکی خوایی وایە و هەزاران جۆری کەرەسە و کۆئەندام و قوتووی خواردەمەنیی تێدایە..

ئەم گەنجینە و کۆگا پەروەردگاری‌یە، بەپێی دەستوورەکانی زانستی: (ژیانسازی و بازرگانی) کە ئێوە دەیخوێنن و، بە ئەندازەی گەورەیی خودی گەنجینەکە، خاوەن و کارسازی خۆیمان پیشان دەدات و پێمان دەناسێنێت و لە لامان خۆشەویستی دەکات. هەروەك ئەو گەنجینەیەی کە دەستکردی مرۆڤ بوو، خاوەن و بەڕێوەبەرەکەی خۆی پێ ناساندین.

❖ نموونەیەکی تر:

ئەگەر سوپایەکی گەورە چوارسەد هەزار گەل و نەتەوەی جیاجیای لە ژێر ئاڵاکەی خۆیدا کۆ کردبێتەوە و، هەریەك لەو ڕەگەز و نەتەوانەش خواردەمەنیی لەوانی تر جیاواز بێت و، چەکی هیچیان لە هی تریان نەچێت و، بەرگ و پۆشاك و شێوەی مەشق کردن و جۆری تەعلیمات و ماوەی پشوودانیان لە یەکتر جیا بێت و، پێشەوای ئەو سوپایە، بێ ئەوەی هیچیانی لەبیر بچێتەوە یان سەری لێ تێك بچێت، خۆراك و پۆشاکی جیاجیایان بداتێ..

ئەو سوپایەی بەم جۆرە بێت، دەری دەخات کە: پێشەواکەی کەسێکی بێ وێنە و ناوازەیە..

جا هەروەك ئەم سەربازگە سەرسووڕهێنەرە ئەو پێشەوا ناوازەیەمان بۆ دەردەخات و پێمان دەناسێنێت و، تەنانەت خۆشەویستیشی دەکات لە لامان، سەربازگەی "زەوی"یش بە هەمان جۆرە. چونکە سەربازگەی زەوی لە هەموو بەهارێکدا سەرلەنوێ سوپایەکی خوایی گەورە لە چوارسەد هەزار ڕەگەز و جۆری گەلانی ڕووەك و نەتەوە جیاجیاکانی زیندەوەران پێك دەهێنێت و، هەر جۆرەشیان پۆشاك و، خۆراك و، چەك و، مەشق و، پشووی تایبەتیی خۆی لە لایەن پێشەوایەکی گەورەی تاك و تەنیاوە، بە بێ لەبیرچوونی هیچ کامێکیان، یان لێ‌تێکچوون، یان سەرگەردان بوون و، بەوپەڕی تەواوی و ڕێکوپێکیشەوە، پێ دەبەخشرێت.

جا بەپێی "زانستە سەربازییەکان" ئەم سەربازگە بەرین و فراوانەی وەرزی بەهار کە بە پانتایی گۆی زەوی بڵاو بووەتەوە، بەڕێوەبەر و پەروەردگار و پێشەوای هەرە مەزن و پیرۆزی خۆی پیشانی هەموو ئەوانە دەدات کە خاوەنی دڵ و دەروون و تێگەیشتن و ژیرین و، بە ئەندازەی پلەی

کەماڵ و گەورەیی ئەم سەربازگەیە، ئەو پەروەردگارەیان پێ دەناسێنێت و، لە ڕێگای تەقدیس و تەسبیح و ڕێزلێنان و سوپاس کردنەوە، لە لایان خۆشەویستی دەکات. وەك سەربازگە ناوبراوەکە ئەمەی سەبارەت بە پێشەواکەی خۆی ئەنجام دا.

❖ نموونەیەکی تر:

وا دابنێ کە ملیۆنان گڵۆپی کارەبا لەناو شارێکی سەرسووڕهێنەردا، بە بێ ئەوەی سووتەمەنییان لێ ببڕێت و بکوژێنەوە، هاتوچۆ بکەن.

ئایا ئەم کارە - لەگەڵ دەربڕینی ڕێز و سەرسووڕماندا - دەری ناخات کە: ئەندازیارێکی بێ هاوتا و کارەباچییەکی کارامە هەیە، کارگەی کارەباکە و ئەو گڵۆپانەی لەژێر دەستدایە؟

بە هەمان جۆر، گڵۆپی ئەو ئەستێرانەش کە بە بنمیچی خانەی زەوییەوە شۆڕ بوونەتەوە و، بەپێی گەردوونناسیی نوێ هەندێکیان بە هەزاران جار لە گۆی زەوی گەورەترن و، خێراییان لە هی تۆپی تۆپخانەکان زیاترە و، بێ ئەوەی ڕێسای نێوانیان تێك بچێت و لە یەکتر بدەن و، بێ کوژانەوە و تەواوبوونی سووتەمەنی کاردەکەن، وەك لە "گەردوونناسی"دا دەیخوێنن.. ئەم ئەستێرانە، بە چەشنێکی ڕووناك، ئاماژە بۆ بەدیهێنەری خۆیان دەکەن.

بۆ نموونە: "خۆر" کە یەك ملیۆن جار لە زەویی خۆمان گەورەترە و یەك ملیۆن ساڵیش لە زەوی کۆنترە، یەکێکە لەو گڵۆپە داگیرساوە هەمیشەییانەی میوانخانەی خواوەندی میهرەبان. جا بۆ ئەوەی هەمیشە دابگرسێت و گڕ بگرێ و سووتەمەنیی لێ نەبڕێت، هەموو ڕۆژێك پێویستیی بە ئەندازەی دەریاکانی زەوی سووتەمەنی و، چیاکانی زەوی خەڵووز و،

چەندین ئەوەندەی قەبارەی زەویش دار دەبێت، تاکو ئەو بەردەوامی‌یەی بۆ برەخسێت..

کەچی ئەو توانستەی کە "خۆر" و هەموو ئەستێرەکانی تری هاوچەشنی خۆر دادەگرسێنێت، بە بێ هیچ سووتەمەنی و خەڵووز و ڕۆنێك ئەم کارە دەکات و نایەڵێت بپشکوژێتەوە و، بە خێرایی‌یەکی یەکجار گەورە و بێ لەیەکدان لە شوێنی خۆیاندا دەیانسووڕێنێت. بێ گومان ئەو توانستەی کە ئەم کارە ڕایی دەکات، توانستێکی بێ کۆتایی و دەسەڵاتێکی تابلێی گەورەی بێ سنوورە.

کەواتە ئەم بوونەوەرە مەزنە و هەرچی گڵۆپ و چرای ڕووناکی تێدایە و پیایدا شۆڕ کراونەتەوە، بە جوانی و بەپێی دەستوورەکانی زانستی "کارەبا" - کە خوێندووتانە یان لەمەولا دەیخوێنن - پادشا و دەسەڵاتداری ئەم پیشانگا و فیستیڤاڵە گەورەیە دەردەخات و، ڕووناککەرەوە و کارساز و بەدیهێنەری خاوەن شکۆی خۆی، بە شایەتیی هەموو ئەستێرە درەخشانەکان بە هەموان دەناسێنێت و، لە ڕێگای سوپاسگوزاری و تەقدیس کردنەوە لە لایان خۆشەویستی دەکات، تەنانەت بۆ پەرستنیشی هانیان دەدات.

❖ نموونەیەکی تر:

ئەگەر کتێبێك هەبێت لە هەموو دێڕێکیدا کتێبێك بە خەتێکی ورد و، لە هەموو وشەیەکیدا سوورەتێکی قورئانی تێدا نووسرابێت و، هەریەك لەو مەسەلە و بابەتانەش کە لێیان دەدوێت ورد و پڕ واتا بن و پشتی یەکتری بگرن، گەر کتێبێکی وا ببێت، ئەوا ئەو کتێبە، بێ هیچ گومانێك، کارامەیی لەڕادەبەدەری نووسەرەکەی و توانستی تەواوی دانەرەکەی دەردەخات..

واتە ئەم جۆرە کتێبە وەك ڕووناکیی خۆر نووسەرەکەی بە خەڵکی دەناسێنێت و کەماڵی توانستی ئەو دەردەخات و، بە چەشنێکی وا ڕێز و

تەقدیری سەیرکەرانی ڕادەکێشێت کە یەکسەر لەبەر خۆیانەوە بڵێن: "تبارك الله، سبحان الله، ما شاء الله".

کتێبی مەزن و گەورەی ئەم گەردوونەش وایە، کە تەنها لە یەك لاپەڕەیدا - کە گۆی زەوییە - و لە یەك مەلزەمەیدا - کە وەرزی بەهارە - سێ سەد هەزار کتێبی جیاجیا، کە ڕووەك و زیندەوەرانن، دەنووسرێن و، هەریەکەیان وەك کتێبێك وان. هەموو ئەمانەش پێکەوە و بە بێ تێکەڵبوون و هەڵە و لەبیرچوونەوە و بەوپەڕی ڕێکوپێکییەوە، دەنووسرێن. تەنانەت لە تەنها وشەیەکیدا (وەك درەخت) پارچە شیعرێکی تەواوەتی و، لە یەك دانە نوختەیدا (وەك تۆو) پێڕستی کتێبێکی تەواو دەنووسرێت.

جا هەروەك ئەمە شتێکە لەبەرچاوماندایە و بێ هیچ گومانێك پیشانمان دەدات کە لە پشتی ئەم نووسینانەوە قەڵەمێکی کارامە هەیە دەیاننووسێت.. ئەوا دەتوانن بۆ خۆتان ئەوە لێك بدەنەوە کە ئایا مەودای بەڵگەی کتێبی گەورە و مەزنی گەردوون، کە لە هەموو وشەیەکیدا چەندین واتا و دانایی تێدایە و.. مەودای بەڵگەی ئەم قورئانە گەورە بەرجەستەیە - کە جیهانە - بزانن چەندەیە و چۆن دەبێت بە بەڵگە لەسەر خواوەندی نووسەری خۆی، هەروەك ئەو کتێبەی لە نموونەکەدا باس کرا، بوو بە بەڵگە لەسەر نووسەرەکەی!

ئەمەش بەپێی داخوازیی (زانستی حیکمەتی شتان) و (هونەری خوێندنەوە و نووسین) کە دەیانخوێنن و، بە تەرازوویەکی گەورەتر و ڕوانینێکی فراوانتر بۆ ئەم کتێبە گەورەیەی گەردوون، دەردەکەوێت..

تەنانەت ئەو کاتە تێدەگەن کە چۆن ئەم کتێبە گەورەیەی گەردوون بە "الله أکبر"کردن خوای بەدیهێنەری خۆی دەناسێنێت و، بە "سبحان الله"

ئاخ! وەها سەرم لـێ شێواوە کە نازانم لە دەست کێ و لای کێ سـکاڵای خۆم بکەم!

* * *

وا من قورئان دەخاتە گوفتار و، بێ هیچ دوو دڵی‌یەك دەڵـێم:
سکاڵای خۆی لای خۆی دەکەم و، وەکو تۆ سەرگەردان نابم!

* * *

لەتاو "حەق" هانا بۆ لای "حەق" دەبەم و، سنووری خۆم ناشکێنم.
لە زەوی‌یەوە بانگ لە ئاسمان دەکەم و، وەك تۆ هەڵ نایەم.

* * *

هەموو بانگەوازێکی قورئانی پیرۆز لە ڕووناکی‌یەوەیە بۆ ڕووناکی، ئیتر من وەکو تۆ پەیمان ناشکێنم.
لـە قـورئـانی پیرۆزدا دانایی ڕاسـتەقینە هەیـە، کـەواتـە مـن ئـەو داناییـەی قورئان دەچەسپێنم و، هیچ بایەخێك بە فەلسەفەی پێچەوانەی قورئان نادەم!
گەنجینەکانی ڕاستی لە قورئاندان..
گیانی خۆمیان لە پێناودا بەخت دەکەم و، وەك تۆ نایانفرۆشم!

* * *

لە خەڵکەوە ڕووە و حەق چاودەگێڕم و، وەك تۆ ڕێ ون ناکەم!
بەسەر ڕێی دڕکاویدا دەفڕم و، وەکو تۆ پێی پێدا نانێم!
شوکرانەبژێریم بۆ ئاسمان بەرز دەبێتەوە و، وەك تۆ سەرپێچی ناکەم!

* * *

"مردن" بە هاوڕێ دەزانم و، وەك تۆ لێی ناترسم!

بە ڕووی گەشاوە و سوورەوە دەچمە ناو "گۆڕ" و، وەکو تۆ لەرزم لێ نایەت!

* * *

من وەکو تۆ "گۆڕ" بە دەمی هەژدیها و پێخەفی سامناکی و دەرگای نەمان، نازانم! بەڵکو بە لای منەوە "گۆڕ" جێی بەیەك گەیشتنەوەی خۆشەویستانە.. کەواتە من وەك تۆ ڕقم لێی نی‌یە و بێزار نیم!

* * *

لێی ناترسم و پێی دڵتەنگ نیم..
چونکە دەرگای میهرەبانی و، ڕووناکی و، ڕاستی‌یە و..
بە ناوی خوا لەو دەرگایە دەدەم و ئاوڕ بۆ دواوە نادەمەوە و، سەرسامی نامگرێت!

* * *

ئیتر بە چاوی ڕوون و ڕووی گەشەوە تیایدا ڕادەکشێم و سوپاسی پەروەردگارم دەکەم و، تەنگانە و سامناکیی تێدا بەدی ناکەم و..
بەدەم زایەڵەی بانگی "اللّٰه أکبر"ی حەشرەوە هەڵدەستم و..
لە مەحشەری هەرە مەزن ناترسم و..
لەو مزگەوتە گەورەیەش دوا ناکەوم!

* * *

هەرگیزاو هەرگیز لە: لوتفی خوا و.. نووری قورئانی پیرۆز و.. ڕێژنەی ئیمان.. نائومێد نابم.
بەڵکو تێدەکۆشم و، ڕووەو عەرشی خوای میهرەبان دەفڕم و..
پشت بە خوا - وەك تۆ - سەرگەردان نابم!

کۆتایی مەکتووبی شازدەهەم:

## بەختەوەرترین مرۆڤ کێیە؟!

مادەم دنیا فانی‌یە و.. تەمەن کورتە و.. ئەرك و واجباتیش گەلێ زۆرن و.. ژیانی هەمیشەیی ئەودنیاش لێرە و لەم دنیایەدا بەدەست دەهێنرێت و هەوڵی بۆ دەدرێت و.. دنیاش بێ خاوەن نی‌یە، چونکە ئەم میوانخانەیە پەروەردگارێکی دەست ڕەنگین و دانای هەیە و، سزا و پاداشتی خراپە و چاکەی لێ ون نابێت و، هیچ ئەرکێك ناخاتە ئەستۆی بەندەکانیەوە گەر لە توانایاندا نەبێت..

هەروەها مادەم ڕێی ڕاست و ڕێیەك ئازاری تێدا بێت وەکو یەك نین و.. هاوەڵان و پلە و پایەکانی دنیاش تا دەرگای گۆڕ زیاتر لەگەڵ مرۆڤدا نایەن..

ئەوا بەختەوەرترین مرۆڤ ئەو کەسەیە کە:

لەبەر دنیا قیامەتی لەبیر ناچێت و.. ئەودنیای بۆ ئەم دنیا نادۆڕێنێت و.. ژیانی هەمیشەیی خۆیشی لەبەر ژیانێکی دنیایی ناشێوێنێت و.. تەمەنیشی بە شتێك پەیوەندیی بەوەوە نەبێ، بەفیڕۆ نادات و.. بە چەشنی گوێڕایەڵیی میوان بۆ میواندار، فەرمانبەرداری فەرمانەکانی خواوەند دەبێت، تاکو دەرگای گۆڕی بە دڵنیایی و ئارامی لێ بکرێتەوە و.. بە سەلام کردنەوە پێ بخاتە ناو خانەی بەختەوەری[1].

---

(١) لەسەر بناغەی ئەم هۆکارانە: نە گوێ بەو ستەمانە دەدەم کە هێنرانە ڕێی خودی خۆم و، نە ئاوڕیش لەو تەنگ پێ هەڵچنینە دەدەمەوە کە لە هەموو لایەکەوە ئابڵوقەی داوم و، دەڵێم: شایانی بایەخ پێدان نین. بۆیە دەست ناخەمە ناو کاروباری دنیا. (دانەر)

## پرسیارێك و وەڵامەكەی:

## باشترین لاوانتان

پرسیاری حەوتەمتان:

ئایا "خيرُ شبابِكم مَنْ تَشَبَّهَ بكهولِكم، وشــرُّ كــهولِكم مَــنْ تَشَــبَّهَ بشــــبابِكم"[1] فــەرموودەی پێغەمبــەرە ﷺ؟ ئەگــەر فــەرموودەی ئــەوە، مەبەستەكەی چی‌یە؟

وەڵام:

بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بیستوومە. مەبەستەكەشی ئەوەیە كە:

"باشترین لاوان ئەوانەن كە بە تەواوی لە خوای گەورە بێ ئاگا نین و لەم ڕووەوە پێیان زۆر لێ ڕانەكێشاوە، بەڵكو بە چەشنی پیران یادی مردن دەكەنەوە و، بۆ ئاوەدان كردنی دوارۆژیان لێدەبڕێن و لە كۆت و زنجیری هەوا و ئارەزووی لاوان خۆیان ڕزگار دەكەن. خراپترین پیرانیشتان ئەوانەن كە لە خوای گەورە بێ ئاگان و بێ ئاگایی لاوی ئەوانیشی ڕاپێچ كردووە و، وەك منداڵ لاسایی هەوا و ئارەزوویان دەكەنەوە".

وێنە ڕاستەكەی ئەوەی كە لە بەشی دووهەمی تابلۆكەتدا بینیبووت، بریتی‌یە لەوەی كە:

لە پشتی سەرمەوە تابلۆیەكم هەڵواسیوە، دانایەكی ڕەوان و ڕێكی تێدایە، بەیانی و ئێوارە سەیری دەكەم و دەرسی لێ وەردەگرم.

(١) أخرجه أبو يعلى والطبراني في الكبير من حديث واثلة. قال العراقي في تخريج الإحياء ٦٢/٣ باسناد ضعيف. وأخرجه البيهقي في شعب الإيمان من حديث أنس ومن حديث ابن عباس. وأخرجه ابن عدي في الكامل من حديث ابن مسعود. وقال ابن الجوزي: لايصح. وقد رمز السيوطي لحسنه. بڕوانە: فيض القدير ٤٨٧/٣.

ئەمەش دەقی تابلۆکەیە:

(ئەگەر دۆستت دەوێت، خوای گەورەت بەسە بیگریت بە دۆست).

بەڵێ، ئەگەر ئەو دۆستت بێت، هەموو شتێك دەبێت بە دۆستت.

(ئەگەر یار و هاودەمت دەوێت، قورئانت بەسە بۆ هاودەمی).

چونکە ئەگەر لەگەڵ قورئاندا هاودەم بیت، ئەوا لەگەڵ پێغەمبەران و مەلائیکەتاندا دەژییت، کە باشترین یار و هاودەمن.

(ئەگەر سامانت دەوێت، ئەوا قەناعەت گەنجینەیەکی سەرروزیادە).

بەڵێ، مرۆڤی قەناعەتکار دەست پێوە دەگرێت، ئەو کەسەش دەست پێوە بگرێت پیت و بەرەکەتی دەست دەکەوێت.

(ئەگەر دوژمنت دەوێت، ئەوا نەفسی خۆتت بەسە).

چونکە بێ گومان ئەو کەسەی لە خۆی ڕازییە، دووچاری موسیبەت و تەنگانە و گیروگرفت دەبێت. بەڵام ئەو کەسەی لە نەفسی خۆی ڕازی نییە، هەمیشە حەوانەوە و شادی و میهرەبانیی دەست دەکەوێت.

(ئەگەر ئامۆژگاریشت دەوێت، ئەوا مردن باشترین ئامۆژگارە).

بەڵێ ڕاستە، ئەو کەسەی مردنی لە یاد بێت، لە خۆشویستنی دنیا ڕزگاری دەبێت و، بۆ دواڕۆژی خۆی لێدەبڕێت و تێدە کۆشێت.

## بۆ لاوی نەخۆش

ئەی ئەو کەسەی بەدەست نەخۆشی‌یەوە گیری خواردووە!

من بەش بە حاڵی خۆم و لە ڕێی تاقیکردنەوەی تایبەتیی خۆمەوە لەم ڕۆژگارەدا، دڵنیایی تەواوم پەیدا کردووە کە نەخۆشی بۆ هەندێ کەس چاکە و بەخششی خوای گەورەیە کە بە میهرەبانیی خۆی بۆیان دەنێرێت[1]!

لە ماوەی ئەم هەشت نۆ ساڵەدا چەند لاوێکی نەخۆش هاتن بۆ لام بۆ ئەوەی دوعایان بۆ بکەم – هەرچەندەش من شایستەی ئەوە نیم – منیش بۆم دەرکەوت کە ئەوانەیان ئازاریان زۆرترە، یادی ڕۆژی دواییان زیاترە و بێ ئاگایی "لاوی"یان تێدا نی‌یە و، تا ڕادەیەکیش لە ژێر کۆڵی قورسی نەخۆشیدا خۆیان لە ڕابواردن و حەز و ئارەزووی ئاژەڵانە دەپارێزن.

منیش یادم دەخستنەوە کە:

هەتا زیاتر ئارامگر بن لە بەردەم ئازاری نەخۆشیدا، ئەوا نەخۆشی‌یەکەیان بە دیاریی میهرەبانیی خوای گەورە دادەنرێت.

هەروەها پێم دەوتن:

کاکی خۆم!

من دژی ئەم ئازارەی تۆ نیم، هەر لەبەر ئەوەشە بەزەییم بە تۆدا نایەتەوە و بۆت ناپاڕێمەوە! بەڵام ئەوەندەت پێ دەڵێم کە:

---

(١) عن أبي هريرة رضي الله عنه أن النبي ﷺ قال: "مَن يرد الله به خيراً يُصب منه". رواه البخاري ومالك. واتە: خوای گەورە نیازی خێری بە هەر کەسێك بێت دووچاری گیروگرفتی دەکات. (وەرگێڕ)

هەوڵ بدە بە شێوەیەکی جوان و ڕەنگین کاڵای ئارامگرتن بە بەرت بپڕیت و لە بەردەم ئازاری نەخۆشیدا خۆت ڕابگریت هەتا چاك دەبیتەوە. چونکە بەدیهێنەری میهرەبان، هەر کاتێ ویستی لەسەری بێت و دوای ئەوەی نەخۆشی‌یەکەت ئەو کار و ئەرکەی پێی سپێرراوە لە تۆدا بە ئەنجامی گەیاند، چاکت دەکاتەوە و شیفات پێ دەبەخشێت.

هەروەها دەم وت:

هەندێ کەس لە هاوتەمەنانی تۆ، تەنها لەبەر ڕابواردنێکی بچووکی ساتێکی ئەم دنیایە، چوارچێوەی خانە و لانەی ژیانی هەتاهەتاییان دەڕووخێنن. ئەوانە لەبەر ڕۆچوونیان لە بێ ئاگاییدا و بەهۆی "بەلای تەندروستی‌یەوە" وازیان لە نوێژ و یادی مردن و ڕۆژی دوایی هێناوە، تەنانەت هەر یادی خواش ناکەنەوە!

بەڵام تۆ لە ڕوانگەی نەخۆشی‌یەکەتەوە، چاوت لەو گۆڕەیە کە خانووی تایبەتیی خۆتە و هەر دەبێ بڕۆیتە ناوی. هەروەها جێگاکانی تری دوای گۆڕیش دەبینیت..

ئیتر تۆ بەپێی داخوازیی ئەم بینین و چاوپێکەوتنە کارەکانت جێبەجێ دەکەیت.

کەواتە ئەم نەخۆشی‌یە بۆ تۆ تەندروستی‌یە و، تەندروستیش بۆ هەندێ کەس نەخۆشی‌یە!

**لە بریسکەی بیست و هەشتەم:**

# باسێکی ورد لەبارەی "نەفس"ەوە

بسم الله الرحمن الرحیم

**یەکێك لە سەرنجەکانی ئایەتی پیرۆزی:**

**﴿إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ﴾** (یوسف:٥٣).

**هەروەها فەرموودەی پیرۆزی**

**"أَعْدَى عَدُوِّكَ نَفْسُكَ الَّتِي بَيْنَ جَنْبَيْكَ"[١].**

**بەڵێ، ئەو کەسەی کە دەروونی بەدخوازی پاکژنەکراوی خۆی خۆش بوێت و لێی ڕازی بێت، لە ڕاستیدا هیچ کەسێکی تری خۆش ناوێت. تەنانەت ئەگەر خۆشەویستی بەرامبەر کەسێکی تر دەربڕێت، ئەوا لە ناخی دڵیەوە خۆشی ناوێت و، لەوانەیە تەنها لەبەر بەرژەوەندییەکانی و ئەو سوودەی لێیەوە چاوەڕێی دەکات، ئەو خۆشەویستییەی لە ڕوودا بنوێنێت!**

---

(١) "أعدى أعدائك نفسك التي بين جنبيك". رواه البيهقي في الزهد بإسناد ضعيف وله شاهد من حديث أنس.. والمشهور على الألسنة: أعدى عدوك..إهـ (كشف الخفاء ١/١٤٣) قال العراقي في تخريج الإحياء (كتاب عجائب القلب): أخرجه البيهقي في كتاب الزهد من حديث ابن عباس، وفيه محمد بن عبد الرحمن بن غزوان أحد الوضاعين. إهـ وقال الزبيدي في شرح الإحياء ٧/٢٠٦ تعقيباً على العراقي: ووجدتُ بخط ابن حجر ما نصّه: وللحديث طرق أخرى غير هذه من حديث أنس. (وەرگێڕ – لە چاپە عەرەبییەکەی "اللمعات"ەوە)

ئەو مرۆڤەی کە ئەمە حاڵیەتی، هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدایە خۆی لای خەڵکی خۆشەویست بکات و ڕەزامەندیی ئەوانی دەستگیر ببێت. لەم پێناوەشدا هیچ قسوور و ناتەواوی‌یەك بۆ خۆی دانانێت، بەڵکو بە چەشنی پارێزەرێکی دڵسۆز بۆ مەبەستی "پاکانە" بەرگری لە خۆی دەکات و، بە چەندەها زیادەڕەوی، تەنانەت درۆ و دەلەسەش، بە شان و باڵی خۆیدا دەخوێنێت، تاکو لە هەموو نەنگی و ناتەواوی‌یەك پاکی بکاتەوە، هەتا دەیگەیەنێتە ڕادەی تەقدیس کردن.

بەڵکو بەوەشەوە ڕاناوەستێ و لەوەش زیاتر پێی لێ ڕادەکێشێت، تا دەیگەیەنێتە ئەوەی ناوەرۆکی ئەم ئایەتەی تێدا بێتەدی کە دەفەرموێ:

﴿مَنِ اتَّخَذَ إِلَـٰهَهُ هَوَاهُ﴾ (الفرقان:٤٣).

ئیتر ئەو کاتە زللەی یەك لە دوای یەکی ئەم ئایەتە دەچێژێت و، بەرامبەر بەو مەدح و ستایشەی کە بۆ خۆی ڕەوای دەبینی، خەڵکی پشتی لێ هەڵدەکەن و.. بەرامبەر بەوەش کە خۆی لای خەڵك خۆشەویست دەکرد، ڕەزای لایان قورس دەبێت و، لە ئەنجامدا پێچەوانەی مەبەستەکانی خۆی دێنە ڕێی!

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە بە بۆنەی ڕیاکاریی لەو کردەوانەدا کە بۆ دوارۆژ دەکرێن، ئیخلاسیش لەدەست دەدات و، لە بەردەم هەست و هەوا و ئارەزووەکانیدا، کە پاشەڕۆژ نابینن و بیر لە ئەنجامەکان ناکەنەوە و تەنها حەزیان لە تام و لەزەتی کاتیی ئێستایە، ئەم لە بەرامبەریانەوە دەستەپاچە دەمێنێت. بەڵکو هەوا و ئارەزووە سەر لێ شێوێنەکانی بۆ جۆرەها کاری وا هانی دەدەن کە لەبەر لەزەت وەرگرتنی لە چێژێکی کەمی یەك سەعاتی، ساڵێکی تەواو، بەڵکو لەوانەیە دە ساڵی ڕەبەقیش، لە بەندیخانەکاندا تەمەن بباتە سەر، ئیتر بەو جۆرە سزای دادگەرانەی خۆی دەچێژێت..

هەموو ئەمانەی دێنە ڕێ، لە پێناوی دامرکاندنی گیانی تۆڵـە سـەندنەوە و، ئارەزووی لەخۆبایی‌بوون، کە خولەکێکیش ناخایەنێت.

ئەو مرۆڤە لەمەدا وەکو ئەو منداڵە نەفامە وایە کە نرخی ئەو جزمەی قورئـان نـازانێت کـە دەرسـی تێـدا دەخوێنێـت و، دەچـێ بـە پارچـە شـیرینی‌یەکی دەگۆڕێتەوە! ئەمیش کردەوە چاکەکانی، کە لە ئەڵماس بـەنرخترن، بە چـەند شتێکی بێ نرخی وەکـو شووشـە وردە دەگۆڕێتـەوە، کـە بریتین لـە هەسـت و هەوا و ئارەزووەکان و لەخۆ بایی‌بوون.

دیارە بەم کارەشی زیانێکی گەلـێ مـەزن دەکـات، لـە شتێکدا کـە دەبـوو قازانجی زۆر و باشی تێدا بکردایە!

اللّهم احفظنا من شرّ النفس والشيطان ومن شرّ الجن والإنس.

* * *

**لە مەسنەویی نووری:**

## بێدارە نوستووەکان!

**من وتەی ئەو شاعیرەم تێدا هاتووەتەدی کە دەڵێ:**

وعيني قد نامَتْ بليلِ شبيبَتي     ولَمْ تنتَبهْ إلاّ بِصُبحِ مَشيبِ[1]

**چونکە ئێستا بۆم دەرکەوت کە بێدارترینی کاتەکانی لاویم، قووڵترینی چینەکانی نووستنم بوون!**

**جا ئەو کەسانەی کە بەپێی نەریت و باوی شارستانێتی بە "ڕۆشنبیر" و "بێدار" دادەنرێن - بە چەشنی بێداریی ئەوسای من - وەکو ئەو کەسە وان کە لە خەونیدا لە خەو بێداربووەتەوە و خەونەکەی بۆ خەڵکی دەگێڕێتەوە! کەچی بەم بێداربوونەوەیەی - لە ڕاستیدا - لە چینی تەنك و ناسکی خەونەکەیەوە ڕۆشتووەتە ناو چینە چڕ و ئەستوورەکەی!**

---

(١) واتە:

کاتێ چاوم نوست "لاوی"ی بوو بە شەو     سپێدەی "پیری" جا هەڵسا لە خەو

دوای گەڕانێکی زۆر بۆم ساغ نەبووەوە ئەم بەیتە شیعرە هی کێیە. بەڵام ڕێم لە دوو بەیتی تر کەوت کە لەم بەیتەوە نزیکن. یەکەمیان هی "أيمن بن محمد الغرناطي"یە، کە ئەمە دەقەکەیەتی:

تناومتُ في أطلال ليلي شبيبتي     فأدركني بالفجر صبح مشيبـــي

دووهەمیان هي "ابن زمرك"ە و بەم دەقە هاتووە:

وكل مَن نام بليل الشباب     يوقظه الدهرُ بصبح المشيب.

بڕوانە: کتێبی (نفح الطيب في غصن الأندلس الرطيب) دانراوی (أحمد بن المقري التلمســــــانی) چاپی "دار صادر، بیروت". دەقی یەکەمیان: ٤/٣٤٢، دووهەمیان: ٤/٧٥٦. (وەرگێڕ)

ئیتر کەسێ کە ئاوا چەشنی مردوو خەوی قورسی لێ کەوتبێت، چۆن زیندووی خەوالوو بێدارەدەکاتەوە و دەتوانێت ئەو قسانەی کە لە پشتی پەردە دوو چەندانەکەی ئەو خەونەیەوە دەیانکات، بیاندات بە گوێی ئەواندا!

دەسا ئەی بێدارە نوستووەکان!

بە ناوی "چاوپۆشیی ئاینی" و "چاو لێکردنەوە" توخنی مەدەنی‌یەکان مەکەون و، لاتان وا نەبێت بەم کارە خۆتان دەکەن بە پردێك لە نێوان ئێمە و ئەواندا و شیوەکەی نێوانمان پڕ دەکەنەوە!

نەخێر.. ماوەی نێوان ئیمانداران و کافران بێ سنوورە و، شیوەکەی نێوانیشمان هێندە قووڵە کە بە ئێوە پڕ نابێتەوە.

خۆ ئەگەر لەم هەوڵەتاندا هەر بەردەوام بن، ئەوا ئێوەش وەك ئەوانتان لێ دێت و گومڕا دەبن و، بە یەکجاری لە ڕێ دەترازێن و دووردەکەونەوە!

* * *

لە مەسنەویی نووری:

## پێش ئەوەی بخنکێیت بێداربەرەوە!

کاکی مرۆڤ!

بزانە کە سەیرترین شتێ بەدیهێنەری دانا لە تۆدا دایناوە، ئەوەیە کە:

هەندێ کاتی وا هەیە هەموو دنیا لە تۆدا جێی نابێتەوە و بە وێنەی بەندکراوێ کە خەریك بێ بخنکێت، بێزار دەبیت و دەڵێیت: "ئۆف"!

کەچی یەك دانە تۆوە خەرتەلە یان خانەیەکی زیندوو یان ختوورەیەك کە بە دڵتدا دێت یان وردیلەیەك، لە تۆدا جێیدەبێتەوە، بە ڕادەیەك کە تیایدا ون دەبیت و توندوتیژترین هەستەکانیشتی بۆ بەکاردەهێنیت!

ئەو بەدیهێنەرە دانایە چەند لایەنێکی ناسکی پێ بەخشیویت کە هەندێکیان دنیا هەڵدەلووشێت و تێر نابێت، هەندێکی تریشیان جێی گەردیلەیەکی تێدا نابێتەوە و گەندەموویەك هەڵناگرێ، بە چەشنی چاو کە جێی تەنانەت موویەکی تێدا نابێتەوە.

کەواتە وریابە و بە ئەسپایی بڕۆ..

نەکەی لە پاروویەك، یان وشەیەك، یان موویەك، یان گەندەموویەك، یان بریسکەیەك، یان نەختە گۆشتێك، یان بەرە ڕووەکێك، یان ماچێکدا بخنکێیت و نیانترینی لایەنە ناسکەکانیشت لەگەڵتدا بخنکێن! چونکە هەموو شتێ لایەنێکی بێ کۆتایی ئەوتۆی هەیە کە دەتوانێ لە خۆیدا نوقمت بکا و قووتت بدات.

سەیری ئاوێنەکەت بکە و بزانە چۆن ئاسمان و هەموو ئەستێرەکانی تێدا نوقم دەبێت و.. بۆ "بیر"ی خۆیشت بڕوانە کە ئەوەندەی تۆوە خەرتەلەیەکە، بزانە چۆن خواوەند زۆربەی ئەو شتانەی تێدا نووسیوە کە لە لاپەڕەی کردەوەکانی خۆت و درێژایی تەمەنتدان!

دەسا پاکی و بەرزی و بێ عەیبی بۆ ئەو بەدیهێنەرەی کە ئەوەندە بە توانایە و، ڕاگیرکەری هەموو شتێکی گەردوونە!

* * *

لە پاشبەندی قەستەمۆنی:

# نەخۆشیی لەبیرچوونەوە

ڕۆژێکیان یەکێك لە قوتابیيە لاوەکانی نـوور کـە قورئـانی پیرۆزیـان لەبەرە، پێی وتم، وەك زۆر کەسی تریش کە دووچاری هەمان حاڵەت دەبن:
ڕۆژ لە دوای ڕۆژ نەخۆشیی لەبیرچوونەوەم پەرە دەسێنێت، چی بکەم؟
وتم:
هـەتا دەتوانیـت بـە "نـەزەری حـەرام" مەڕوانـە. چونکـە وەك لـە ئیمـامی شافیعیيەوە - خوای لێ ڕازی بێت - دەگێڕنەوە فەرموویەتی:
"ڕوانینی حەرام لەبیرچوونەوەی لێ دەکەوێتەوە"[1].
بەڵێ، هەتا ڕوانینی حـەرام لـەناو موسڵمانانـدا لـە زیـادبووندا بێـت، ئـەوا ئارەزووەکـانی دەروونیـان پـتر هـەڵدەچێت و، لەوەشـەوە ئیسـراف و زیادەڕەوی پەرە دەسێنێت، بە ڕادەیەك کە مرۆڤ ناچار دەبێت لە ماوەی یەك حەفتەدا چـەندین جـار خـۆی بشـوات. دیـارە ئەمـەش - وەك لـە زانسـتی پزیشکیدا زانراوە - توانای لەبەرکردنی ئەو مرۆڤە بەرەو لاوازی دەبات.

---

(١) لەوانەیە مەبەست لەم شیعرەی ئیمامی شافیعی بێت کە دەفەرموێت:

شکوت إلى وکيع سوء حفظي ... فأرشدني إلى ترك المعاصـي
وأخبرنـي بأن العلـم نـور ... ونور الله لا يُهدى لعاصـي

بڕوانە:
ديوان الإمام الشافعي، ص٥٤، جمع محمد عفيف الزعبي. نشر دار النور - بيروت. (وەرگێڕ)

ئەو هۆیەش کە نەخۆشیی لەبیرچوونەوەی بەو چەشنە گشتی‌یە پەرە پێ داوە، زۆری و پەرەسەندنی ڕووتیی ئافرەتانە لەم سەردەمەدا، بە تایبەت لە ناوچە گەرمەسێرەکاندا. چونکە ئەم کارە بووە بەهۆی زۆربوونی ڕوانینی حەرام، کە ئیسراف و زیادەڕەوی بەرهەم دەهێنێت.

ئەمەش لە ڕادەیەکی وەهادایە کە هەموو کەسێك و، هەرکەسەش بە ڕادەی گیرۆدە بوونی بەو نەخۆشی‌یە، سکالای لەبیرچوونەوەی لێ دەبیستیت کە دووچاری بووە.

لەوانەیە تەئویلی لایەنێکی ئەو فەرموودە پیرۆزەی کە مەترسیی لابردنی قورئان لە سنگی خەڵکی ئاخر زەماندا ڕادەگەیەنێت، بە زیادبوونی ئەم نەخۆشی‌یە بێتەدی.

واتە: ئەم نەخۆشی‌یە پتر پەرە دەسێنێت هەتا ڕێ دەگرێت لەوەی قورئانی پیرۆز لەبەر بکرێت.

ئەو کاتەش تەئویلی فەرموودەکە دێتەدی.

ولا يعلمُ الغيبَ إلاّ الله.

لە پاشبەندی قەستەمۆنی:
(نامەیەکی گرنگە)

# "تەقوا" و "کردەوەی چاك"

باسمه سبحانه
السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

لەم رۆژانەدا بیرم لە بناغەکانی "تەقوا" و "کردەوەی چاك" کردەوە، کە لە روانگەی قورئانەوە دوای "ئیمان" بە دوو بناغەی یەکجار مەزن دادەنرێن.

"تەقوا" بریتیيە لە:

وازهێنان لە حەرام و دوورەپەرێزی لە گوناه و تاوان.

"کردەوەی چاك"یش بریتیيە لە:

جێبەجێ کردنی ئەو شتانەی لە لایەنی خوای گەورەوە فەرمان دراوە بەجێ بهێنرێن، بە مەبەستی دەستکەوتنی خێر و پاداشتی باش.

جا لەم سەردەمەدا، کە بە بۆنەی وروژاندنی حەز و خواستەکانی دەروونی بەدخواز و پەت بچڕاندنی ئارەزووکانەوە، کاولکاریی "ڕەوشتی و گیانی" پەرەیان سەندووە، "تەقوا" دەبێت بە بناغەیەکی گەلێ مەزن، تەنانەت بە بەردی هەموو بناغەیەك و، لە هەموو شتێك باشتر و مەزنتر دادەنرێت..

چونکە "تەقوا" - لە خۆیدا - دوورخستنەوەی خراپکاریيە و وازهێنانە لە تاوانە گەورەکان.

ئەو دەستوورەش کە دەڵێت: "دوور خستنەوەی خراپکاری لە نزیك خستنەوەی شتی سوودمەند باشترە" دەستوورێکە لە هەموو کاتێکدا ڕەفتاری پێ دەکرێت.

ئنجا لەبەر ئەوەی لەم کاتەدا ئەو تەوژمە وێرانکارانە لە پەرەسەندندان کە "گیان" و "ڕەوشتی مرۆڤ" تێکدەشکێنن، ئەوا "تەقوا" بووە بە بناغەیەکی گەلێ مەزن و بەربەستێکی یەکجار گەورە بۆ بەرهەڵست کردن لەم کاولکاری‌یە سامناکە.

جا ئەو کەسەی کە فەرزەکانی بەجێ دەهێنێت و ناڕوات بە لای تاوانی گەورەدا، بە ئیزنی خوا، ڕزگاری دەبێت. چونکە بەجێهێنانی کردەوەیەکی خاوێن و بێگەرد، لە ناوەندی ئەم هەموو تاوانە گەورانەی دەوروبەردا، یەکجار دەگمەنە.

"کردەوەی چاك" با کەمیش بێت، لە نێوان ئەم مەرجە گران و بارودۆخە سەختەدا بە زۆر دادەنرێت. ئنجا هەر لەناو "تەقوا"دا "کردەوەی چاك"یش هەیە! چونکە وازهێنان لە حەرام واجبە، پاداشتی بەجێهێنانی واجبیش گەلێ لە هی سوننەتەکان زیاترە.

جا دوورەپەرێزی لە تەنها یەك دانە گوناه، لەگەڵ بەجێهێنانی کردەوەیەکی کەم، ئا لەم چەشنە کاتانەدا کە تاوان و گوناه لە هەموو لایەکەوە هێرش بۆ مرۆڤ دەهێنن، وەك وازهێنان وایە لە سەدان گوناه (کە لەو تەنها گوناهەوە پەیدا دەبوون گەر بکرایە) و، وەك جێبەجێ کردنی سەدان واجب وایە.

ئەم خاڵە شایانی بایەخ پێدانە و، بە "نیيەتی خاوێن و، تەقوا و، مەبەستی هەڵهاتن لە گوناهباری" نەبێت، بەدەست نایەت.

مرۆڤ لەم ڕووەوە دەتوانێت پاداشتی چەندین کردەوەی چاکی دەست بکەوێت کە تیایاندا ماندوو نەبووە.

گرنگترین ئەرکێ لەم کاتەدا دەکەوێتە ئەستۆی قوتابیانی نوور و خزمەتگوزارانی قورئانەوە، ئەوەیە کە:

"تەقوا" بکەن بە بناغەی هەموو کردارەکانیان و، لە بەردەم تەوژم و لێشاوی کاولکاریی سامناك و هێرشبەر و، لە بەرامبەر ئەو گوناهـ و تاوانانەی ئابلۆقەیان داون، بەپێی "تەقوا" هەنگاو بنێن، چونکە مرۆڤ لە هەموو خولەکێکی ئەم چەشنە ژیانە کۆمەڵایەتی‌یانەی ئێستادا ڕووبەڕووی سەدان گوناهـ دەبێتەوە.

خۆ بێ هیچ گومانێك تەنها تەقوایە لە ڕێی مرۆڤدا کە هێندە پاداشتی بۆ دەستەبەر بکات وەك ئەوەی سەدان کردەوەی چاکی بەجێ هێنابێت، چونکە بە بۆنەی "تەقوا"وە لەو سەدان حەرام و گوناهانە دوورەپەرێزی دەکات!

ئاشکرایە کە بیست کەس ناتوانن لە بیست ڕۆژدا کۆشکێك بنیات بنێن، کەچی یەك کەس دەتوانێت لە یەك ڕۆژدا بیڕووخێنێت!

لەبەر ئەوە، دەبێت لە بەرامبەر ئەو کەسەی کە سەرگەرمی کاولکاری‌یە "ڕەوشتی و گیانی"یەکانە، بیست کەس هەبن ئەو لایەنانە بنیات بنێن و ئاوەدانیان بکەنەوە.. کەچی ئێمە پێچەوانەی ئەمە دەبینین؛ ئەوەتا هەزاران کاولکار تەنها یەك بنیاتنەر و ئاوەدانکەریان لە بەرامبەرەوەیە، ئەویش "پەیامەکانی نوور"ە.

کەواتە بەرگری کردنی خزمەتگوزارانی قورئان، بە تەنها خۆیان، لە بەرامبەر ئەو کاولکاری‌یە سامناکانەوە، لە ڕاستیدا، کارێکی نائاساییە. خۆ ئەگەر ئەو دوو هێزە بەرامبەرە لە یەك ئاستدا بوونایە، ئەوا شتی لەعادەت

بەدەری زیاتر و فتووحاتی گەلێ مەزنتر لە بنیاتنان و ئاوەدانکردنەوەی "گیانی و ڕەوشتی"دا دەبینی.

با تەنها یەك نموونە لەسەر ئەمە بهێنینەوە:

گەورەترین بەردی بناغەی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەوەیە کە "بچووك ڕێزی گەورە بگرێت و، گەورەش بەزەیی بە بچووکدا بێتەوە". کەچی دەبینین ئەم بناغەیە لە زۆر لاوە درز و کەلێنی تێ کەوتووە. تەنانەت ئێستا لە ئەنجامی تێکچوونی ئەم بناغەیە، چەندەها هەواڵی یەکجار دڵتەزێن و ڕووداوی تەواو ناهەموار بەرامبەر باوکان و دایکان، دەبیستین.

بەڵام بە فەزڵی خوای گەورە، پەیامە قورئانی‌یەکان بڕۆنە هەر جێگایەك، بەرەنگاری کاولکاری دەبنەوە و نایەڵن ئەم بناغە کۆمەڵایەتی‌یە بڕووخێت، بەڵکو هەوڵی چاككردنەوەشی دەدەن.

هەروەك بە ڕووخانی بەربەستەکەی "زولقەرنەین" یەئجووج و مەئجووج دەست دەدەنە خراپکاری لە ڕووی زەویدا، بە هەمان جۆر لە ئەنجامی جێ لەق بوونی بەربەستی مەزنی قورئانیشدا کە شەریعەتی خاوێن و بێگەردی حەزرەتی محەممەدە ﷺ خراپکاریی گەلێ زیاتر لەوەی یەئجووج و مەئجووج لە وشکایی و دەریاکانی سەر ڕووی زەویدا بڵاو بووەتەوە، کە بە تاریکایی تۆقاندن و ئاژاوە چواردەوری جیهانی داگرتووە و، چەندەها ستەم و ئیلحادی لەڕادەبەدەریش سەرانسەری ژیان و ڕەوشتی مرۆڤیان داپۆشیوە.

کەواتە جیهادی مەعنەویی قوتابیانی نوور کە بەرەنگاریی لافاوی ئەم تەوژمە ڕامالەر و سەختەی پێ دەکەن، بە ئیزنی خوا، بە جیهادێکی ئەوتۆ بۆیان دەنووسرێت کە پاداشتی گەورە و زۆریان دەست بخات، چونکە ترووسکاییەك لە جیهادی هاوەڵە بەڕێزەکان، کە لەسەر کردەوەی کەم پاداشتی زۆریان دەدرێتەوە، تێکەڵی جیهادی ئەمان بووە.

دەسا برا ئازیزەكانم!

گەورەترین هێزی ئێمە، لەم كاتە پڕ لـە تەنگانـە و لـە بـەردەم ئـەم ڕووداوە مەزنانەدا، دوای هێزی "ئیخلاس"، بریتی‌یە لـە هـێزی "بەشداری كردن لـەو كردارانەدا كە بە نیازی پاداشتی دوارۆژ ئەنجام دەدرێن"!

چونكە بەم بەشداری‌یە، هەموو یەكێكی ئێوە چەندین كـردەوەی چـاك لە دەفتەری چاكەكاری‌یەكانی برایانیدا دەنووسێت، هەروەك بە زمانیشی هێز و یارمـەتی و پشتگیری بۆ قـەڵا و سـەنگەر و سپێرەكانی "تـەقوا" دەنێرێت، بـە تایبەت ئەم بـرا هـەژارەی خۆتـان كـە لـە هـەموو لایەكەوە هێرشـی سـەخت و نائامـانی لەسـەرە، چونكـە لـەم سێ مانگـە پیرۆز و ڕۆژە بەبەرەكەتانـەدا زۆر پێویستی بە یارمەتیی ئێوەیە.

ئەمەش لە ئێوە بە دوور نازانم، چونكە ئێوە شایانی ئەم هەوڵەن و، پاڵەوانی وەفادارن و، بەزەییتان بە حاڵی ئەم برایەتاندا دێتەوە.

وا من بە هەموو جەستە و زمانم و لــە قووڵایـی و نـاخی دڵـمـەوە داوای ئـەم یارمەتیدانـە مەعنەوی‌یـەتان لـێ دەكـەم و، لـە لایـەنی خۆیشـمەوە لـە دوعـا و چاكەكاری‌یـە مەعنەوی‌یـەكانمدا قوتابیـان هاوبـەش دەكـەم، تەنانـەت هـەندێ جار لە ماوەی یەك ڕۆژدا سـەد جـار زیـاتر بـە نـاوی "قوتابیـانی نـوور" ناوتـان دەهێنـم و دوعاتـان بۆ دەكـەم، بـە مـەرجی دەستبەردار نـەبوون لـە "ئیمـان" و "وەفا" كە دەستووری بەشداری‌یە لە كردەوەكانی سەر بە دوارۆژدا.

سەعیدی نوورسی

* * *

لە پاشبەندی قەستەمۆنی:

# لاپەڕەیەکی ژیان

بەسەرهات و مێژووی ژیانم زۆر کەس دەیزانن:

◆ ئەوەبوو دوای ئەوەی کە "عومەر پاشـا" هـەوڵێکی یـەکجار زۆری لەگەڵ دام بڕۆمـە ماڵیـان، چونکـە ڕێزێکـی زۆری لـە زانسـت و زانایـان دەگرت، دوو سـاڵ لـە مـاڵی خواڵێخۆشـبوو عومـەر پاشـای نـاوبراودا لـە "بەدلیس" مامەوە..

ئەم پیـاوە شەش کچی هـەبوو؛ سیانی بچـووك و سـیانی گـەورە. جـا هەرچەندە من ماوەی دوو ساڵ لـەو ماڵـەدا ژیـام، کـەچی کچـە گـەورەکانیم نەدەناسین، چونکە بۆم نەدەڕوانین تا بیانناسم و لێکیان جیا بکەمەوە.

جارێکیان زانایـەك بـوو بـە میـوانم و، لـە مـاوەی دوو ڕۆژدا ئـەو کچانـەی ناسی و لە یەکی جیا کردنەوە!

ئەوانەی لە دەوروبەرمدا بوون، سەریان سـووڕدەما لـەوەی کـە چـۆن مـن نایان ناسم.. پرسی‌یان:

بۆچی سەیریان ناکەیت؟

پێم وتن:

"پارێزگاری کردنی عیززەت و سەربەرزیی زانست نایەڵێت سەیر بکەم"!

* * *

◆ لە یەکێکی ئەو فیستیڤاڵانەی کە چل ساڵ پێش ئێستا لە ئەستەمبووڵ ساز کرا، حەشاماتێکی زۆر ئامادە بوون و، لەم بەر و ئەوبەری ئەو کەنداوەی کە ئەستەمبووڵ دەکات بە دوو بەشەوە ئافرەتانی ئەستەمبووڵ و، ئافرەتە ڕۆم و ئەرمەنیی‌یە پۆشتە و ڕووتەکان، ڕیزیان بەستبوو.

منیش لەگەڵ کاك تاها و کاك ئیلیاسدا (کە هەردووکیان ئەندامی پەرلەمان بوون) سواری بەلەمێك بووین، تاکو بگەینە جێی ئاهەنگ گێڕان لە کۆتایی کەنداوەکەدا.

بەلەمەکە بە بەردەمی ئەو ئافرەتانەدا دەڕۆیشت..

منیش ئاگاداری ئەوە نەبووم کە مەلا تاها و حاجی ئیلیاس زووتر قسەیان کردووە بە یەك کە بە نۆرە سەیرم بکەن و، تاقیم بکەنەوە و، بزانن بۆ ئافرەتەکان دەڕوانم یان نا؟

دوای سەعاتێکی تەواوی گەشتی ناو ئاو بەو بەلەمە و بەناو ئەو ئافرەتانەدا، خۆیان دانیان پیادا نا و وتیان:

سەرمان لە تۆ سووڕماوە.. خۆ بە هیچ جۆرێ سەیرت نەکردن!

وتم:

"من ئەو تام و چێژە کاتی و بێ نرخ و ئاوێتەی ئازارانەم ناوێت.. چونکە ئەنجامەکانیان ئازار و حەسرەتە"!

---

تێبینی:

دانەر دوای ئەم باسە، بەشێکی (وتەی سی و دووهەم)ی هێناوە بە ناونیشانی: (هۆ و نهێنیی بەدبەختیی گومڕایان و بەختەوەریی ئیمانداران). ئێمەش، لەبەر ئەوەی لە (ڕابەری خوشکان)دا ئەو باسەمان بڵاو کردەوە، بە پێویستمان نەزانی لێرەشدا بڵاوی بکەینەوە. تکایە با خوێنەری بەڕێز لەوێ بیخوێنێتەوە. (وەرگێڕ)

لە بریسکەی چواردەهەم:

## هەندێ لە نهێنی‌یەکانی:

## ﴿بسم الله الرحـــمن الرحيم﴾

(لە نێوان هەزاران نهێنیی ﴿بسم الله الرحـــمن الرحيم﴾دا
ئەم مەقامە شەشیان باس دەکات)

وریاکردنەوەیەك:
نوورێکی درەخشان کە لە ئاسۆی: ﴿بسم الله الرحـــمن الرحيـــم﴾ هەڵهاتبوو، دووراودوور بۆ عـــەقڵی خامۆشـم دەرکـەوت. ویسـتم لــە شێوەی یادخستنەوە و تێبینیدا بۆ خۆمی تۆمار بکــەم و، هـەوڵم دا ئـەو نوورە درەخشانە وەك نێچیر بگرم و بیخەمە چنگەوە و، بە نهێنی‌یـەکانی خۆی، کە نزیکی سی دانە دەبن، شوورایەکی بە دەوردا بگێڕم تاکو بــە ئاسانی دەستنیشان بکرێـت و بنووسـرێت. بـەڵام بـە داخـەوە ئێسـتاکە سـەرکەوتنم بـە تـەواوی لـەم کـارەدا بەدەسـت نـەهێنا. لەبـەر ئـەوە، نهێنی‌یەکانی لێرەدا کەم بوونەوە و تەنها لە شەش دانەدا مانەوە.

گوفتاری ئـەم مەقامـە، بـە تایبـەتی و ڕاستەوخۆ ئاراستەی دەروونـی خـۆم کـراوە، چونکـە کاتێ کـە لـەم مەقامـەدا دەڵێـم: "ئـەی مـرۆڤ"! مەبەسـتم دەروونی خۆمە.

جا هەرچەند ئەم وانەیە تایبەتە بە خۆمەوە، دەیشی‌خەمە پێش چاوی ڕاستبینی برایانی وردەکارمەوە، تاکو ببێت بە "مەقامی دووهەمی بڕیسکەی چواردەهەم". ئومێدەوارم سوودبەخش بێت بۆ هەرکەسێك کە پەیوەندیی ڕۆحیی لەگەڵمدا هەیە و دەروونی لە هی من وریا و بێدارترە.

جا ئەم وانەیە زیاتر ڕوو لە "دڵ" دەکات تاکو "ژیری".. بۆ چێژی "ڕۆحی" زیاتر دەڕوانێت تاکو بەڵگەی "مەنتیقی".

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿قالَتْ يا أَيّها الْمَلَؤُ إِنّي أُلْقِيَ إِلَيَّ كتابٌ كريمٌ ۞ إِنَه مِنْ سُلَيْمانَ وإِنَّهُ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيمِ﴾ (النمل:٢٩-٣٠)

وا لەم مەقامەدا چەند نهێنییەك باس دەکەین:

☐ نهێنیی یەکەم:

لە کاتی بیرکردنەوەمدا لە ﴿بسم الله الرحـــــمن الرحيـم﴾ یەکێك لە نوورەکانیم بەم جۆرەی خوارەوە بینی:

سێ نیشانەی ڕوون و ئاشکرای پەروەردگارێتیی خوای گەورە بە سەروسیمای بوونەوەران و، ڕووی زەوی و، ڕوخساری مرۆڤەوە هەن. ئەم نیشانە ئاشکرایانەش هێندە لەناو یەکتردان و تێهەڵکێشی یەکترین، کە هەریەکەیان نموونەیەکی ئەوانی ترە.

*نیشانەی یەکەم:* نیشانەی "ئولووهییەت"ە..

ئەو نیشانە گەورە و درەخشانەی: هاوکاری و، پشتگیری و، بەدەم یەکەوە هاتن و، دەست لەملانێیەی کە لە هەموو بەشێکی گشت گەردووندا هەیە. بە چەشنێ کە: ﴿بسم الله﴾ ڕووی تێدەکات.

*نیشانەی دووهەم:* نیشانەی "ڕەحمانی‌یەت"ە..

ئەو نیشانە مەزنە ئاشکرایەی: لەیەکچوون و، پێکەوەگونجان و، ڕێکی و، نەرمونیانی و، میهرەبانی‌یە، کە لە پەروەردە کردنی ڕووەك و زیندەوەراندا هەیە. بە چەشنێ کە: ﴿بسم الله الرحـــمن﴾ ڕووی تێدەکات.

*پاشان نیشانەی سێهەم:* نیشانەی "ڕەحیمییەت"ە..

ئەو نیشانە بڵند و ڕوونەی کە لە: نەرمونیانیی میهرەبانیی خوا و، وردەکاریی شەفەقەتی و، تیشکەکانی بەزەییەکەیەوە دەردەکەوێت، کە بە سەروسیمای چییەتیی گشتیی مرۆڤەوە کێشراوە و ڕەنگی داڕێژراوە. بە چەشنێ کە ناوی "الرحیم"ی: ﴿بســم الله الرحــــمن الرحیــم﴾ ڕووی لێیەتی و بۆی دەڕوانێت.

واتە ﴿بسم الله الرحـــمن الرحیــــم﴾ ناونیشانێکی بەرز و خاوێنی سێ نیشانەیە لە نیشانەکانی تەنیایی(الأحدیـــة)ی خوای گەورە. بە ڕادەیەك کە بووە بە دێڕێکی نوورانیی ناو کتێبی بوونەوەر و، خەتێکی ڕووناك لەسەر لاپەڕەی جیهاندا دەکێشێت و، دەستاوێزێکی ئەستوور و مەحکەمی نێوان بەدیهێنەر و بەدیهێنراوانی خوایە.

ئەمەش مانای وایە کە مادەم ﴿بسم الله الرحـــمن الرحیــــم﴾ لە عەرشی هەرە مەزنەوە نازڵ بووە، ئەوا سەرێکی پەیوەستە بە مرۆڤەوە کە بەروبوومی بوونەوەران و نوسخەی بچووکی جیهانە. کەواتە زەوی بە عەرشی مەزنەوە دەبەستێت و دەبێت بە ڕێیەکی تەخت و ئاسان بۆ ئەوەی مرۆڤ بەرەو عەرشی کەماڵاتی سەربکەوێت و بەرز ببێتەوە.

□ نهێنیی دووهەم:

قورئانی پیرۆز هەمیشە لە نێوان باسی دەرکەوتنی یەکتایی(واحیدییەت)دا دەرکەوتنی تەنیایی(ئەحەدییەت)یش ڕوون دەکاتەوە، تاکو نەهێڵێت عەقڵان

لە ناوەندی ئەو واحیدییەتە ئاشکرایەی ناو بوونەوەرە لەژمارەبەدەرەکاندا، نوقم و سەرگەردان بین.

با بە نموونەیەك ئەمە ڕوون بکەینەوە:

خۆر(الشمس) بە ڕووناکی‌یەکەی خۆی دەوراندەوری چەندەها شتی لەژمارەبەدەری داوە. جا بۆ ڕەچاوکردنی "خودی خۆر" لە کۆی گشتیی هەموو ڕووناکی‌یەکانیدا پێویست بە تەسەووڕێکی گەلێ فراوان و ڕوانینێکی یەکجار گشتی دەبێت. لەبەر ئەوە، خۆر بەهۆی دەرکەوتن و ڕەنگدانەوەی ڕووناکی‌یەکەیەوە لە هەموو شتێکی بریسکەداردا، خۆی دەردەخات.

واتە: هەموو شتێکی بریسکەدار بەپێی توانای خۆی، درەوشانەوەی خۆیی خۆر و تایبەتمەندی‌یەکانی وەك: ڕووناکی و، گەرمیی، دەردەخات. ئەمەش بۆ ئەوەی "خودی خۆر" لە بیر نەبرێتەوە.

جا هەروەك هەموو شتێکی بریسکەدار بەپێی توانای خۆی، خۆر و هەموو سیفەتەکانی خۆر دەردەخات.. هەموو یەکێکیش لە سیفەتەکانی خۆر، وەك: گەرمی و ڕووناکی و حەوت ڕەنگەکانی، هەموو ئەو شتانە دەگرنەوە کە لە بەرامبەریانەوەن.

جا لەبەر ئەوەی نموونە هێنانەوە قڕەوبڕەی تێدا نی‌یە، وا بۆ نموونە - ولله المثلُ الأعلی - دەڵێین:

خواوەندی تەنیا و صەمەد، بە هەموو ناوە جوانەکانی، درەوشانەوەی لە هەموو شتێکدا هەیە و تیایدا دەردەکەوێت، بە تایبەت لە زیندەوەراندا و، بە تایبەت‌تریش لە ئاوێنەی ماهییەتی مرۆڤدا. هەروەها هەموو یەکێك لەو ناوە جوانانەی خواوەند کە پەیوەندی‌یان بە بوونەوەرانەوە هەیە، لە ڕووی "وەحدەت" و "واحیدییەت"ەوە دەوراندەوری هەموو بوونەوەرانیان داوە.

بەم چەشنە، قورئانی پیرۆز مۆری "ئەحەدییەت" لە دووتوێی "واحیدییەت"دا دەخاتە پێش چاوی مرۆڤ، تاکو "ژیری‌یەکان" لەناو فراوانیی "واحیدییەت"دا نوقم نەبن و، "دڵان"یش سەرسام نەبن و، زاتی خاوێن و پیرۆزی خوای گەورەیان لە بیر نەچێتەوە.

جا: ﴿بسم الله الرحمن الرحیم﴾ دەبێت بە بەڵگە لەسەر سێ گرێ(عُقدة)ی گرنگی ئەو مۆرە جوداکەرەوەیە و ڕوونی دەکاتەوە.

❑ نهێنیی سێهەم:

شتێکی بەڵگەنەویست، بەڵکو بینراوە کە:

تەنها میهرەبانیی خواوەندە بوونەوەرە لە ژمارە و سنوور بەدەرەکانی خستە کەیف و شادی‌یەوە و.. هەمان میهرەبانیش بوو کە ئەم بوونەوەرانەی ڕووناك کردەوە و لە تاریکی دەری هێنان بەرەو ڕووناکیی بردن و.. هەر هەمان میهرەبانی بوو ئەم بوونەوەرە لە ڕادەبەدەر موحتاجانەی لە باوەشی خۆیدا گۆش و پەروەردە کرد.. هەر ئەو میهرەبانی‌یەش بوو گشت بوونەوەرانی لە هەموو شوێنێکەوە ڕێنمایی کرد و بەرەو لای مرۆڤ خستنیەڕێ و ژێربار و ڕامی کردن بۆی، تەنانەت وای لە بوونەوەران کرد بۆ یارمەتی و هاوکاریی مرۆڤ بڕۆن و بڕوانن، بە وێنەی ڕوانینی بەشەکانی درەخت بۆ بەروبوومەکەی.. هەروەها میهرەبانیی خوای گەورەشە کە ئەم بۆشاییە فراوانەی ئاسمانی ئاوەدان کردووەتەوە و، ئەم جیهانە بۆش و بەتاڵەی ڕازاندووەتەوە.. هەمان میهرەبانیشە کە وای لەم مرۆڤە فانی‌یە کردووە دەستنیشانکراوی مانەوە و نەمری بێت و، کردوویەتی بە شایستەی گفتوگۆی پەروەردگاری جیهانیان و، "پایە"ی بڵندی "پشتگیریی خوای گەورە"ی پێ بەخشیوە.

ئەی مرۆڤ! مادەم "میهرەبانی" سیفەتێکی خۆشەویستە و تا ئەم ڕادەیەش هێز و کێش و یارمەتی و فریاگوزاریی هەیە، ئەوا بە وتنی: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ دەست بەو ڕاستی‌یەوە بگرە و، لە سامناکیی بێزاریی ڕەها و، ئازاری چەندەها پێداویستیی بێ کۆتایی خۆت ڕزگار بکە و، لە خوای خاوەنی عەرشی بەرزی و پادشای میهرەبان خۆت نزیك بخەرەوە و، بەهۆی ڕووناکی‌یەکان و شەفاعەتی ئەو میهرەبانی‌یەوە ببە بە کەسێکی ئەمینی شایستەی گفتوگۆی ئەو میهرەبانی‌یە و دۆستی ڕاستی ئەو.

بەڵێ، جەم‌کردنی بوونەوەران لە دەوری مرۆڤ و لە ناوەند دانایی‌یەکی دەستنیشان‌کراودا و، هاندانی هەریەکە لە بوونەوەران بۆ ئەوەی پێداویستی‌یە هەمیشە زیادبووەکانی مرۆڤ نەهێڵن، دەبێ لە یەکێکی ئەم دوو حاڵەتەوە سەری هەڵدابێت:

یان ئەوەیە هەموو جۆرێك لە جۆرەکانی بوونەوەران مرۆڤ دەناسێت و پێی دەزانێت و گوێڕایەڵیەتی و بۆ خزمەتکردنی تێدەکۆشێت. واتە: یان ئەوەیە ئەم مرۆڤەی کە بە ئاشکرا لە کۆڵەواری و بێ دەسەڵاتی‌یەکی ڕەهادا نوقم بووە، خاوەنی توانا و دەسەڵاتێکی ڕەهایە!! (ئەمەش وەك دیارە، سەرباری ئەو مەحاڵە لەژمارەبەدەرانەی کە تیایدایە، لە بیرکردنەوەی عەقڵیشەوە گەلێ دوورە)..

یان ئەوەیە ئەو بوونەوەرانە مرۆڤ ناناسن، بەڵکو ئەوان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە یەکێك هەیە، ئەم مرۆڤە دەناسێت و بەزەیی پێدا دێتەوە و بە حاڵی دەزانێت! ئەو کەسەش بەدیهێنەری میهرەبانە.

دەسا ئەی مرۆڤ! بەرەو هۆش و ژیریی خۆت بگەڕێرەوە! ئایا دەگونجێ ئەم پەروەردگارە میهرەبانە نەتبینێت و ئاگای لێت نەبێت، کە هەر ئەوە گشت بوونەوەرانی بۆ یارمەتی و نەهێشتنی پێداویستی‌یەکانت ناردووە؟

جا مادەم خواوەند بە تۆ دەزانێت و لەم زانینەش ئاگادارت دەکاتەوە، بەوەی کە بەزەیی پێتدا دێتەوە، ئەوا تۆ هەر ئەوەندەت لەسەرە کە تێبکۆشیت بۆ ناسینی و، هەوڵ بدەیت بە ڕێزنان لە فەرمانەکانی، ئەو خواناسینەتی بۆ ئاشکرا بکەیت.

بەوپەڕی دڵنیایی و بێ گومانییەوە بزانە کە: تەنها ڕاستیی ئەم میهرەبانییەی خوای گەورەیە - کە میهرەبانییەکە دانایی و، چاودێری و، زانست و، توانستیش دەگرێتەوە - ئەم بوونەوەرانەی بۆ تۆ ڕام کردووە و خستوونیەتە ژێر فەرمانی ویستی تۆی بەدیهێنراوی لاواز و، بچووك و، دەستەوسان و، هەژار و، فانی!

میهرەبانییەك تا ئەم ڕادەیە مەزن و بەم ئەندازەیەش فراوان بێت، بێ گومان داوای شوکرانەبژێرییەکی گشتی و بێگەرد و ڕێزگوزارییەکی بێ خلتە و خاوێنت لێ دەکات. بیشزانە جگە لە ﴿بسم الله الرحـمن الرحيم﴾ هیچ شتێکی تر نییە ئەم شوکرانەبژێرییە گشتی و ڕێزگوزارییە بێگەردەت بۆ دەربڕێت. کەواتە هەردەم دووپاتی بکەرەوە و بیکە بە هۆکارێك بۆ گەیشتنت بەو میهرەبانییە فراوانە و، تکاکارت لە خزمەت بەخشندەی میهرەباندا.

لە ڕاستیدا بوون و ئاشکرایی "میهرەبانی" لە بوونەوەردا گەلێ ئاشکراترە لە خۆری ناوجەرگەی ئاسمان.

هەروەك نەخشێکی جوان بەوە دروست دەبێت کە تانوپۆی تاڵەکانی لە چەقی نەخشەکەوە بۆ دەوروبەری و لە دەوروبەریشیەوە بۆ ناوچەقی نەخشەکە، هەموویان بە ڕێکی تەنراین و هۆنراینەوە.. بە هەمان جۆر، یەك بە یەکی تاڵە تیشکەکانی ئەو نوورەی کە لە هەزار و یەك ناوی جوانی خوای گەورەوە تیشك دەدەن و دەدرەوشێنەوە و، تا دەگەنە ئەم بوونەوەرە زۆر و

فراوانانە هاتوون و کشاون و درێژبوونەتەوە، بەوپەڕی جوانی و لە چوارچێوەی میهرەبانی‌یەکی گشتیدا، مۆرێکی ڕوونی "ڕەحیمییەت"و، نەخشێکی قەشەنگی "شەفەقەت و میهرەبانی" و، دروشمێکی یەکجار ناوازەی ئەوتۆ پیشانی "ژیران" دەدەن کە گەلێ ئاشکراترە لە ڕوونی و ئاشکرایی خۆر لە پێش "چاوان"دا!

بەڵێ، ئەو کەسەی کە خۆر و مانگ و هەموو توخم و کانزا و ڕووەك و زیندەوەران بە تیشکی هەزار و یەك ناوی خۆی ڕێکدەخات و، بە چەشنی تانوپۆ و تاڵە نوورانی‌یەکانی نەخشونیگارێکی ناوازە لەگەڵ یەکتردا دەیانگونجێنێت و، هەموویان بۆ خزمەتگوزاریی ژیان دەخاتەکار و، بەو شەفەقەتە بەلەزەتە شیرینەش کە لە دایکانی ڕووەك و زیندەوەراندا بۆ بێچووەکانیان داینـاوە، شەفەقەت و میهرەبانیی خۆی بەرامبەر هەموو بوونەوەران دەرخستووە..

ئەو کەسەی کە بە ڕامکردن و ژێربارخستنی زیندەوەران بۆ ژیانی مرۆڤ، بریسکەدارترین درەوشانەوەکانی میهرەبانی و جوانترین نەخشونیگاری خۆی ئاشکرا کردووە و، بەمەش پایە و ڕێز و گرنگیی مرۆڤی بە لای خۆیەوە، پیشان داوە..

ئەو کەسەی لەگەڵ بەدیهێنراوانیدا ئاوایە، تەنها ئەو خواوەندە بەتوانا و میهرەبانەیە کە ئەم میهرەبانی‌یە فراوانەی خۆی کردووە بە تکاوەرگیراوی دەرگانەی دەوڵەمەندیی ڕەهای خۆی. بە چەشنێ کە زیندەوەران و مرۆڤی یەکجار هەژار تکای پێ دەکەن و پێی دەپاڕێنەوە.

ئەی مرۆڤ!

ئەگەر بە ڕاستی مرۆڤیت، ئەوا هەمیشە بڵێ: ﴿بسم الله الرحمن الرحیم﴾ تاکو ئەو تکاکار و شەفاعەتخوازەت دەست بکەوێت.

شتێکی بەڵگەنەویست، بەڵکو بینراوە کە تەنها "میهرەبانی"یە هەموو تیرە و جۆرەکانی ڕووەك و زیندەوەران - هەرچەندەش جۆراوجۆر و جیاوازن و لە چوارسەد هەزار تیرە و جۆر زیاترن - پێدەگەیەنێت و پەروەردەیان دەکات.. هەر ئەو "میهرەبانی‌یە"شە کە لە باشترین کات و بە تەواوترین ڕێسا و لەبارترین چاودێری و، بە بێ لێتێکچوون و لەبیرچوونەوە، کاروباری هەموویان ڕێکدەخات، بە ڕادەیەك کە مۆری "ئەحەدییەت"ی بەم پەروەردەکردن و ڕێکخستنەی لە سەروسیما و ڕوخساری ڕووی زەوی داوە.

بەڵێ، بوونی ئەو میهرەبانی‌یە، بە وێنەی بوونی بوونەوەرانی ڕووی زەوی، بێ گومان و چەسپاوە. هەروەك بەڵگەکانی هاتنەدیی ئەو میهرەبانی‌یەش بە ئەندازەی ژمارەی ئەو بوونەوەرانەیە.

هەروەك نیشانەی "ئەحەدییەت" و مۆری "میهرەبانی" بەسەر ڕووی زەوی‌یەوە دەبینین، بە هەمان جۆر مۆری "میهرەبانی"ش بە سەروسیمای ماهییەتی مەعنەویی مرۆڤەوە دەبینین. ڕوونیی ئەم مۆرە هەرگیز لە ڕوونیی ئەوەی کە بەسەر ڕووی زەوی و ڕووی بوونەوەرانەوەیە، کەمتر نی‌یە. تەنانەت نیشانەی ئەم میهرەبانی‌یە ئەوەندە گشتی و فراوانە دەڵێی تیشکۆیەکە ڕووناکیی درەوشانەوەکانی ناوە جوانەکانی خوای گەورەی تێدا کۆ دەبێتەوە.

ئەی مرۆڤ! ئایا دەگونجێ ئەو کەسەی کە ئەم سیما و ڕوخسارە مەعنەوی‌یەی پێ بەخشیویت و، نیشانەی "میهرەبانی" و نووری "ئەحەدییەت"یشی لەو ڕوخسارە مەعنەوی‌یەت داوە، وازت لێ بهێنێت و گوێت نەداتێ و چاودێریی جموجووڵ و کردارەکانت نەکات؟ ئایا دەگونجێ بێ هیچ ئامانج و سوودێك ڕووی بوونەوەران بۆ لای تۆ وەربچەرخێنێت؟

یان درەختی مەزنی بوونەوەران بکات بە درەختێکی زڕی بێ کەڵك و، بەروبوومەکەشی دابڕزێنێت؟ یان هەرگیز ڕێی تێدەچێت "میهرەبانی"یەکەی کە وەك ڕۆژ ئاشکرایە و هیچ دوودڵی و گومانێك هەڵناگرێت و، "دانایی"یەکەی کە بە چەشنی نوور ڕووناکە، وا لێ بکات ئینکاری بکرێن؟

نەخێر.. نەخێر. هەرگیز شتی وا ناگونجێ و خواوەند زۆر لەوە گەورەترە.

ئەی مرۆڤ! بزانە میعراج(پلیکانە)ێك هەیە بۆ ئەوەی مرۆڤی پێدا سەربکەوێت تا دەگاتە عەرشی ئەو میهرەبانیە. ئەو میعراجەش: ﴿بسم الله الرحمن الرحیم﴾ە.

خۆ ئەگەر دەتەوێت ڕادەی گرنگی و مەزنی و پایە و پلەی ئەو میعراجە بزانیت، ئەوا سەیری سەرەتای سەد و چواردە سوورەتەکانی قورئانی پیرۆز و، هەموو کتێبێکی بەنرخ و، گشت کارێکی باش بکە!

تەنانەت ئەو فەرمایشتەی ئیمامی شافیعی و موجتەهیدانی هاوچەشنی - خوایان لێ ڕازی بێت - کە فەرموویانە: (هەرچەند ﴿بسم الله الرحمن الرحیم﴾ یەك ئایەتە لە قورئاندا، بەڵام سەد و چواردە جار نازڵ بووە) ئەم فەرمایشتە، بەڵگەیەکی مەزنە لەسەر گەورەیی و ڕێز و پایەبڵندیی: ﴿بسم الله الرحمن الرحیم﴾.

□ نهێنیی چوارەم:

هەموو کەسێ کە بڵێت: ﴿إِيّاكَ نعبدُ﴾ بە تەواوی دەرکی درەوشانەوەی "واحیدییەت" لە بەدیهێنراوە لەژمارەبەدەرەکاندا ناکات، لەبەر ئەوەی کە بیری مرۆڤ لەو زۆرییەدا ون دەبێت و سەری لێ تێکدەچێت..

چونکە بۆ ڕەچاوکردنی زاتی تەنیای خوای گەورە لە ڕێی تێکڕای بوونەوەرانەوە کاتێ بە ﴿إِياكَ نعبدُ وإِياكَ نستعين﴾ گوفتاری لەگەڵ

دەکرێت، بۆ ڕەچاو کردنی ئەمە، پێویست بە دڵێکی هێندە مەزن دەبێت کە جێی هەموو زەویی تێدا ببێتەوە، لەبەر ئەمە و لەسەر بناغەی ئەم نهێنی‌یە وردە، خوای گەورە نیشانە و مۆری "ئەحەدییەت" بە ئاشکرا لە هەموو "بەشێك"دا دەردەخات، هەروەك لە نێوان "ڕەحمانی‌یەت"دا لە هەموو "جۆرەکانی"دا پیشانی دا.

ئەمەش بۆ ئەوەی کە سەرنج تەنها بۆ لای زاتی خوای گەورەی "ئەحەد" ڕابکێشرێت و، بۆ ئەوەش کە هەموو کەسێك - لە هەر پلەیەکدا بێت - بتوانێت لە کاتی وتنی ﴿إياكَ نعبدُ وإياكَ نستعين﴾دا، بێ هیچ تەکەللوف و قورسی وزەحمەتێك، ڕاستەوخۆ ڕوو لە زاتی خاوێن و بەرزی خوای گەورە بکات.

لەبەر ڕوونکردنەوەی ئەم نهێنی‌یەیە کە دەبینیت قورئانی پیرۆز کاتێ باسی نیشانەکانی خوای گەورە لە ئاسۆکان و فراوانترین بازنەدا دەکات، یەکسەر باسی بچووکترین بازنەی بوونەوەران و بچووکترین شتی جوزئیشیان دەکات، تاکو مۆری "ئەحەدییەت" بە ئاشکرا لە هەموو شتێکدا دەربخات.

نموونەی ئەمە:

کاتێ قورئانی پیرۆز نیشانەکانی خواوەند لە بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەویدا ڕوون دەکاتەوە، یەکسەر نیشانەکانیشی لە بەدیهێنانی مرۆڤدا و ڕوونکردنەوەی وردەکاریی ئەو نیعمەتانەی لە دەنگیدا و ناوازەیی ئەو دانایی‌یانەش لە ڕەنگ و ڕوخساریدا، ڕوون دەکاتەوە. تاکو "بیر"ی مرۆڤ لەناو ئاسۆ فراوان و زۆرەکاندا پەرتەوازە و، "دڵ"یشی نوقمی ناو زۆری‌یەکی بێ کۆتایی نەبێت و، "گیان"یشی، بێ بوونی هیچ هۆیەك لە نێواندا، ڕاستەوخۆ بە پەرستراوی ڕاستەقینەی خۆی شاد ببێت.

ئەم ئایەتەی خوارەوە بە ڕوونکردنەوەیەکی ئیعجازبەخش، ئەم ڕاستی‌یەی پێشوو ڕوون دەکاتەوە:

﴿ومن آیاتِهِ خَلقُ السموات وَالأرضِ وَاختلافُ ألسنتِکُم وألوانِکُم﴾ (الروم: ٢٢).

پاشان هەرچەندە نیشانە و مۆرەکانی "وەحدانییەت" بە ئەندازەیەکی گەلێ زۆر و بێ کۆتایی لە بەدیهێنراواندا، هەر لە فراوانترین نیشانە و مۆری هەمەکی‌یەوە تا دەگاتە بچووکترین نیشانە و مۆری هەندەکی، لە چەندین بازنەی تێهەڵکێش و چەندین پلە و جۆری جیاجیا و زۆر و زەبەندەدا، دانراون..

هەرچەند ئەم نیشانە و مۆرانەی "وەحدانییەت" ئاوا ڕوون و ئاشکران، کەچی هێشتا ڕوونی‌یەکەی لە نێوان چەندین بەدیهێنراوی زۆر و زەبەندەدایە و، کاتێ دەوترێت ﴿إیّاكَ نعبد﴾ مافی تەواوی خۆیان نادرێتێ..

لەبەر ئەوە، پێویست دەکات مۆری "ئەحەدییەت"یش لە دووتوێی مۆری "وەحدانییەت"دا ببێت بۆ ئەوەی ڕێ بۆ "دڵ" بکاتەوە تاکو بە گەیشتنی بە زاتی بێ چەندوچۆنی پاك و پیرۆزی خوای گەورە، شاد و شەرەفمەند ببێت، بێ ئەوەی زۆریی بوونەوەرانی بیر بخاتەوە.

پاشان بۆ مەبەستی ڕاکێشانی سەرنجی چاوان و دڵان بەرەو مۆری "ئەحەدییەت"، نەخشێکی ناوازەی تابلێی سەرنج ڕاکێش و.. نوورێکی درەخشانی لەوپەڕی ڕووناکیدا و.. شیرینی‌یەکی بەتام لەوپەڕی چێژ و لەزەتدا و.. جوانی‌یەکی خۆشویستراو لەوپەڕی دڵگیریدا و.. ڕاستی‌یەکی ڕەگداکوتاو لەوپەڕی بەهێزیدا.. لەسەر ئەو نیشانەی "ئەحەدییەت"ە دانراوە، کە ئەویش نیشانەی بەزەیی و مۆری میهرەبانی‌یە.

بەڵێ، تەنها هێزی ئەو بەزەیی‌یەیە کە سەرنجی خاوەن هەستان بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت و دەستیان دەگرێت و دەیانگەیەنێت بە مۆر و نیشانەی "ئەحەدییەت" و، وایان لێ دەکات زاتی پیرۆزی خوای تەنیا ڕەچاو بکەن، بە

چەشنێ کە مرۆڤ بە گفتوگۆی ڕاستەقینەی ﴿إياك نعبدُ وإياك نستعين﴾ شەرەفمەند و بەهرەوەر دەکات.

بەم جۆرە بۆمان ڕوون بووەوە کە مادەم ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ پێرستی "فاتیحە" و پوختەیەکی کورتی "قورئانی پیرۆز"ە، ئەوا بووە بە ناونیشان و تەرجومانێك بۆ ئەم نهێنییە مەزنەی کە باس کرا..

جا ئەو کەسەی کە دەتوانێت ئەم ناونیشانەی دەست بکەوێت، دەشتوانێت بە ناو چینەکانی بەزەیی و میهرەبانیدا بگەڕێت و، ئەو کەسەش ئەم تەرجومانە دەخاتە گفت، ئەوا لە نهێنییەکانی میهرەبانیش تێدەگات و دەیانزانێت و، نوورەکانی میهرەبانی و بەزەییش دەبینێت.

☐ نهێنیی پێنجەم:

فەرموودەیەکی پیرۆز دەفەرموێ:

"إن الله خلق آدم على صورة الرحمن"[1]. أو كما قال ﷺ.

هەندێ لە شوێنکەوتووانی تەریقەتە سۆفییەکان بە چەشنێکی سەیر ئەم فەرموودە پیرۆزەیان لێك داوەتەوە کە بۆ بیروباوەڕی ئیمانی ناشێت و لەگەڵیدا ناگونجێ. تەنانەت هەندێ لە ئەهلی عیشق گەیاندوویانەتە ئەوەی کە تەماشای سیمای مەعنەوییی مرۆڤ بە شێوەیەك بکەن کە وەك شێوەی خوای گەورەی ڕەحمان وابێت!

جا لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەهلی عیشق لە بارێکی بێ ئاگاییدان و نوقمی دەریای عیشقن و شتانیان لێ دەئاڵۆزێت، ئەوا لەوانەیە لەو شتانەدا کە بە

---

(١) "خلق الله عز وجل آدم على صورته.." حديث صحيح أخرجه البخاري برقم ٦٢٢٧ ومسلم برقم ٢٨٤١ وأحمد ٣١٥/٢ وابن خزيمة في التوحيد ص٢٩. أما حديث "إن الله خلق آدم على صورة الرحمن" فقد عزاه الحافظ في الفتح ١٨٣/٥ لابن أبي عاصم في السنة والطبراني من حديث ابن عمر رضي الله عنهما، وقال الحافظ باسناد رجاله ثقات. (وەرگێڕ – لە چاپە عەرەبییەکەی "اللمعات"ەوە).

پێچەوانەی حەقیقەتەوە وەری دەگرن بەهانەیان وەربگیرێت. بەڵام کەسانی وریا و بەئاگا و بێدار، بە تەواوی دەست بە ڕووی ئەو چەشنە واتایانەوە دەنێن کە پێچەوانەی بناغەکانی ئیمانن و، وەریان ناگرن. خۆ ئەگەر هەر کەسێك پێیان ڕازی بێت، ئەوا هەڵەی کردووە و لە ڕاستی لایداوە.

بەڵێ، ئەو کەسەی کاروباری گەردوون ڕێکدەخات و وەك ئەوەی گەردوون خانوویەك، یان کۆشکێك بێت، ئاوا بە ئاسانی بەسەر کاروباریدا زاڵ و فەرمانڕەوایە..

ئەو کەسەی کە ئەستێرە و تەن و قەبارەکانی ئاسمان بەوپەڕی دانایی و ئاسانی و بە چەشنی گەردیلەکان دەجوولێنێت..

ئەو کەسەی کە گەردیلەکان فەرمانەکانی ئەو جێبەجێ دەکەن و ملکەچی دەبن..

بەڵێ، ئەو کەسەی کە هەموو ئەم کارانە ئەنجام دەدات، تەنها خواوەندی مەزنی پاك و پیرۆزە.

جا هەرچەندە زاتی پیرۆز و بێ چەند و چۆنی ئەو خواوەندە گەورەیە: بەرز و بڵند و پاك و پیرۆزە لەوەی کە هاوبەشی بێت، چونکە بەپێی دەقی قورئانی پیرۆز کە دەفەرموێ: ﴿لیسَ کَمِثْلِهِ شَيْءٌ وهُوَ السَّمیعُ الْبَصِیرُ﴾ (الشوری:١١) نە هاوبەشی هەیە، نە هاوتا و، نە دژ و، نە هاوشێوە و، هاوچەشن. بەڵام کاروبارە پڕ لە دانایی و سیفەتە مەزن و ناوە جوانەکانی، بە چاویلکەی نهێنییەکانی نموونە هێنانەوە (ضرب الأمثال) سەیر دەکرێن کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا ڕوون کراوەتەوە: ﴿ولَهُ المَثَلُ الأَعْلى فِي السموات والأَرضِ وهوَ العزیزُ الحکیم﴾ (الروم:٢٧). واتە "نموونە هێنانەوە" لە کاتی باسکردنی کاروبارە پڕ لە دانایییەکانی خوای گەورەدا، بواری پێ دراوە و، کارێکە ڕوو دەدات.

ئەم فەرموودە مەزنە چەندین مەبەستی مەزنی زۆری تێدایە..

یەکێك لەوانە ئەوەیە کە:

"مرۆڤ" بە شێوەیەکی هێندە ناوازە دروست کراوە کە ناوی جوانی "الرحمن"ی خوای گەورە بە تەواوی لە خۆیدا دەربخات.

بەڵێ، بەپێی ئەوەی لە نهێنییەکانی پێشوودا ڕوونمان کردەوە، ئەوا:

هەروەك ناوی: "الرحمن" لە تیشکەکانی دەرکەوتنی هەزار و یەك ناوی جوانی خوای گەورە بەسەر ڕووی گەردوونەوە دەدرەوشێتەوە..

هەروەها وەك ناوی: "الرحمن" بە چەندین درەوشانەوەی لەژمارەبەدەری پەروەردگاریی ڕەهای خوای گەورە، بەسەر ڕوخساری زەوییەوە پیشان دەدرێت..

بە هەمان جۆریش، خوای گەورە درەوشانەوەی هەرە تەواوی ناوی "الرحمن" لە شێوە و وێنە(صورة)ی گشتیی مرۆڤدا، بە پێوانەیەکی بچووکتر دەردەخات، بە چەشنی ئەوەی کە لە سیمای "زەوی" و "گەردوون"دا بە تەرازوویەکی فراوانتر و گەورەتر پیشانی دەدات.

هەر لەم فەرموودە پیرۆزەدا ئاماژەیەك هەیە بۆ ئەوەی کە:

مرۆڤ و زیندەوەران ئەوەندە ڕواڵەتیان تێدایە و هەموویشیان دەبن بە بەڵگە لەسەر خواوەندی: "الرحمن الرحیم" کە وەك ئاوێنەی تیشك بەخشی درەوشانەوەکانی خوای گەورە وان. چونکە هەروەك وێنەی خۆر لە ئاوێنەدا دەردەکەوێت و بەمەش دەبێت بە بەڵگە لەسەر بوونی خۆر، مرۆڤیش بە هەمان جۆر، دەبێت بە بەڵگەیەکی ڕوون و بێ گومان لەسەر بوونی خوای گەورە..

جا هەروەك دەتوانرێت بەو ئاوێنەیە بوترێ: "ئەوە خۆرە" بۆ ئەوەی ئاماژە بۆ ڕادەی ڕوونی و بەڵگەبوونی لەسەر خۆر بکرێت، دەشتوانرێت بوترێ

- وەك لـە فەرموودەکەدا وترا -: مرۆڤ وێنەی "الرحمن"ی تێدایە، تـاکو ئاماژە بکرێت بۆ ئـەوەی کـە مـرۆڤ بـە ڕوونـی بەڵگەیـە لەسـەر نـاوی: "الرحـمن" و موناسەبەتێکی تەواوەتی و پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵدا هەیە.

شوێنکەوتە میانەڕەوەکانی ڕێبـازی "وحدة الوجود" لەسەر بناغەی ئەم بەڵگەیە و، وەك ناونیشـانێك بۆ تـەواویی موناسـەبەتی نێـوان خـوا و بـەندە، وتوویانە: "لا موجود إلاّ هو".

اللهمَّ يا رحمنُ يا رحيم!

بحق: ﴿بسم الله الرحـــمن الرحيم﴾ ارحمنا كما يليق برحمتك، وفـــهمنا أسرار ﴿بسم الله الرحـــمن الرحيم﴾ كما يليق برحيميتك. آمين.

☐ نهێنیی شەشەم:

ئەی ئـەو مرۆڤـەی کـە لـە نـاوەندی دەستەوسـانییەکی بـێ کۆتـایی و هەژارییەکی بێ سنووردا دەتلێتەوە!

ئەگـەر دەتـەوێت تێبگـەیت لـەوەی کـە چـۆن "میـهرەبانی" گـەورەترین هۆکار و ئومێدبەخشـترین شەفاعەتخوازە، ئەوا بزانە:

"میـهرەبانی" بـەهێزترین هۆیـە بـۆ گەیشـتن و شـادبوون بـە خزمـەت پادشـایەکی مـەزن و شـکۆمەندی ئـەوتۆ کـە ئەستێرە و گەردیلـەکان، وەکـو یەك، بەوپەڕی تەواوی و ڕێکوپێکی سەربازی گوێڕایەڵی ئەون..

ئەو پادشا شکۆمەندەی کە پەروەردگاری جیهانیانە و هیچ پێویستییەکی بە هیـچ کـام لـە بەدیـهێنراوانی نییـە و، بەسـەر هـەموویاندا بالاّدەستە و، پێویستیی بە هیچ لایەکی بوونـەوەران نییـە. بـەڵکو هـەموو شتێك لـە بـەردەم مـەزنیی ئـەودا بچووکیـی خـۆی دەنوێنێـت و سـەری بـۆ توانسـتی ئـەو دانەواندووە و، ملی بۆ عیززەت و سام و شکۆی ئەو کەچ کردووە.

کەواتە ئەی مرۆڤ!

"میهرەبانی" بۆ دیوان و حوزووری ئەو دەوڵەمەندە ڕەهایە تۆ بەرز دەکاتەوە و، دەتکات بە خۆشەویستی ئەو پادشا هەمیشەییە مەزنە. تەنانەت بۆ پلەی مەزنی گفتوگۆ لەگەڵ کردنی ئەو دەتبات و دەتکات بە خۆشەویست و بەندەیەکی بەڕێزی لای ئەو.

بەڵام هەروەك تۆ ناگەیتە خۆر، چونکە لێی دووریت، تەنانەت هەر ناشتوانیت بە هیچ جۆرێك نزیکی بکەویتەوە و، لە ڕێی ئاوێنەیەکەوە ڕووناکی و درەخشانی و وێنەی خۆیت دەداتێ..

ئێمەش بە وێنەی ئەمە، هەرچەند لە زاتی خاوێنی خوای گەورەوە گەلێ دوورین، بەڵام نووری "میهرەبانی"یەکەی، ئەومان لێ نزیك دەخاتەوە.

ئەی مرۆڤ!

کەسێك ئەم میهرەبانییەی دەست بکەوێت، گەنجینەیەکی مەزنی نەبڕاوەی پڕ لە نووری دەست کەوتووە. بیشزانە ڕێی گەیشتن بەم گەنجینە مەزنە ئەوەیە کە:

درەخشانترین نموونەی میهرەبانی و، باشترین نوێنەری ئەو میهرەبانییە و، ڕەوانبێژترین زمانێك باسی بکات و، بەڕێزترین بانگەوازکار بۆ لای، تەنیا ئەو کەسەیە کە لە قورئانی پیرۆزدا بە: ﴿رَحْـمةً للعالمين﴾ (الأنبياء:١٠٧) واتە: "میهرەبانیی جیهانیان" ناو براوە، کە پێغەمبەری خۆشەویستمانە ﷺ..

جا باشترین ڕێ بۆ گەیشتن و دەستکەوتنی ئەو گەنجینە هەمیشەییە: شوێنکەوتنی سوننەتی پیرۆزی ئەوە.

بەڵام ئایا چۆن و لە ڕێی چ هۆکارێکەوە مرۆڤ بەو پێغەمبەرە خۆشەویستە ﷺ شاد بێت؟

ئەو هۆکارە سڵاوات لەسەردانیەتی!

بەڵێ، سڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ واتای میهرەبانی دەگەیەنێت، چونکە سڵاوات بریتییە لە دوعای ڕەحمەت و میهرەبانی بۆ ئەو ڕەحمەت و میهرەبانییە بەرجەستە و زیندووە و، هۆکارێکە بۆ گەیشتن و شادبوون بەو "میهرەبانیی جیهانیان"ە.

دەسا ئەی مرۆڤ! سڵاواتدان لە دیداری ئەو پێغەمبەرە ئازیزە ﷺ بکە بەهۆی پێ گەیشتن و پێ شادبوونی. پاشان دەستی پێوە بگرە تاکو بتگەیەنێتە میهرەبانیی خواوەندی "ڕەحمان و ڕەحیم".

خۆ کاتێ کە هەموو نەتەوەی ئیسلام دوعا دەکەن و، سڵاوات لەسەر ئەو پێغەمبەرە ئازیزە ﷺ دەدەن، بە ڕوونی مەودای ئەم میهرەبانییە و، ڕادەی گرنگیی و فراوانیی ئەم دیارییە خواییە، دەچەسپێنن.

بە کورتی:

گەنجینەوان و، بەڕێزترین بانگەوازکاری دەرگانەی گەنجینەی میهرەبانیی خواوەند، زاتی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزەیە ﷺ..

هەروەك بەنرخترین کلیلی ئەو گەنجینەیەش: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ە و..

بناغەی ئەو شتەش کە دەیکاتەوە: سڵاواتدانە لەسەر ئەو پێغەمبەرە ﷺ.

اللّهُمَّ بِحَقِّ: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ صَلِّ عَلى مَنْ أَرْسَلْتَهُ رَحْمَةً لِلعالمين كَما يَليقُ بِرَحْمَتِكَ وَبِحُرْمَتِهِ، وَعَلى آلِهِ وَأَصْحابِهِ أَجْمَعينَ.

وَارْحَمْنا رَحْمَةً تُغنينَا بِهَا عَنْ رَحْمَةِ مَنْ سِواكَ مِنْ خَلْقِكَ. آمين.

﴿سبحانكَ لا علمَ لنا إلاّ ما علّمتنا، إنّك أنت العليم الحكيم﴾.

# پوختەیەک لە ژیانی دانەر

* ناوی "بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی"یە.

* لە نێوان چیا بڵندەکان و لە گوندی "نوورس"ی سەر بە پارێزگای "بەدلیس"ی کوردستانی ژێر دەستەڵاتی عوسمانی لە بنەماڵەیەکی کوردی دیندار لەدایك بووە.

* لە نێوان ساڵەکانی (١٨٧٦-١٩٦٠ز)دا ژیاوە.

* "صۆفی میرزا"ی باوکی بە خواپەرستی و پیاوچاکی بەناوبانگ بووە و، هەر خۆراکێك حەڵاڵ نەبووبێت دەرخواردی مناڵەکانی نەداوە.. خاتوو "نووریە"ی دایکیشی بە پاك و خاوێنی و دەستنوێژەوە نەبووبێت شیری بە مناڵەکانی نەداوە!

* دایکی لە کاتی جەنگی جیهانیی یەکەم و، باوکیشی لە ساڵەکانی بیستی سەدەی پێشوودا کۆچی دواییان کردووە و، لە گۆڕستانی گوندی نوورس نێژراون.

* چوارەم مناڵی خانەوادەکەیانە کە یەك لە دوای یەك ئەمانەن: (دوڕڕییە، خانم، عەبدوڵڵا، سەعید، محەممەد، عەبدولمەجید، مەرجان).

* لە تەمەنی چواردە ساڵیدا بڕوانامەی زانایی لە زانستە ئیسلامییەکاندا بەدەست هێناوە.

* بە هەوڵ و تەقالای خۆی شارەزایی لە زانستەکانی ڕۆژگاردا، وەك: کیمیا فیزیا، بایۆلۆجی، جیۆلۆجی، بیرکاری، گەردووناسی، جوگرافیا، هتد.. پەیدا کردووە.

* لەبەر زیرەکیی ناوازە و لە ڕادەبەدەری، نازناوی (سەعیدی مەشهوور) پاشان (بەدیعوززەمان)ی لە لایەن زانایانەوە پێ دراوە.
* یەکەم کەسە هەوڵی داوە بۆ دامەزراندنی زانکۆ لە کوردستاندا و، کردنەوەی قوتابخانەی کوردی و، خوێندنی وانەی زانستەکانی سەردەم شان بە شانی زانستە ئاینییەکان.
* گەورەترین کەسایەتیی کوردی ئەم سەردەمە و مەزنترین زانایە کە لە دوای مەولانا خالیدی نەقشبەندی لەناو نەتەوەی کورددا هاتووەتە دنیاوە و، ناوبانگی جیهانیی بۆ دروست بووە و، لە ڕووبەرێکی فراوانی سەر زەویدا سوود لە بەرهەمەکانی وەردەگیرێت.
* تاکە کەسایەتی بووە کە هەموو زەبر و زەنگێکی مستەفا کەمال و دامودەزگا چەوسێنەرەکانی و سی و پێنج ساڵی بەندی و زیندانی تاکە کەسی و ڕەهەندەیی و دەست بەسەری و دەیان دادگای تۆقێنەر نەیانتوانیوە چۆکی پێ دابدەن و لە خەباتی ڕەوای خۆی کۆڵی پێ بدەن. تەنانەت ئەو توانیویەتی سەرکەوتنیشیان بە سەردا بە دەست بهێنێت.
* زیاتر لە سەد و سی کتێب و نامیلکەی لە ژێر ناونیشانی (سەرجەمی پەیامەکانی نوور)دا نووسیوە و بڵاوی کردوونەتەوە.
* وەرگێڕانی سەرجەمی پەیامەکانی نوور بۆ (زمانی عەرەبی) لە لایەن مامۆستا (ئیحسان قاسم صالحی)یەوە تەواو بووە و، لە دە دانە بەرگی قەشەنگدا و لە هەردوو شاری ئەستەمبووڵ و قاهیرە چەند چاپێکی یەك لە دوای یەکیان تا ئێستا لێ بڵاوکراوەتەوە.
* بەشێکی زۆریشیان لە لایەن خوشکی نۆموسڵمان: ماری وێلد (شوکران واحیدە)وە کراون بە (زمانی ئینگلیزی) و، تا ئێستا پێنج بەرگی گەورەیان بە چاپی جوان و مۆدێرن بەو زمانە لێ بڵاو کراوەتەوە.

*بە (زمانی کوردی)ش تا ئێستا پێنج بەرگی گەورەی بە شێوەیەکی نایاب لێ چاپکراوە، جگە لە سی کتێب و نامیلکەی سەربەخۆ.

* ئەم پەیامانە بۆ چل و حەوت زمانی نەتەوەکانی جیهان وەرگێڕراون، کە تا ئێستا کاری وەرگێڕان تیایاندا بەردەوامە، وەك زمانەکانی:

ئەڵمانی، فەرەنسی، ڕووسی، ئۆردی، فارسی، ئیتالی، کۆجاراتی، مەلایا، ڕۆمانی، چینی، بولگاری، پورتوگالی، ئەلبانی، بۆسنی، ئیسپانی، مەقەدۆنی.. هەروەها گەلێ زمانی تریش.

* تا ئێستا زیاتر لە پازدە کۆنگرەی جیهانی و دەیان کۆڕی زانستی و پێشبڕکێی ڕۆشنبیریی لە ئاستی جیهاندا لەسەر کراوە و، دەیان کتێب و، سەدان لێکۆڵینەوەی لەسەر نووسراوە و، چەندین بڕوانامەی زانکۆییشی لە خوێندنی باڵادا لەسەر وەرگیراوە، کە هەندێکیان لە کوردستاندا بووە.

* دواهەمین کۆنگرەی جیهانی لەسەر مامۆستا بەدیعوززەمان لە شاری ئەستەمبووڵ لە بەرواری (٣-٥/١٠/٢٠١٠ز)دا ساز کرا و، چەندین کەسایەتیی زانستی لە (چل و چوار) وڵاتەوە بەشدارییان تێدا کرد کە توێژەرانی (سی وسێ) وڵات لەوانە سەد و پێنج دانە توێژینەوەی زانستییان پێشکەش کرد.

* لە "باشووری کوردستان"یشدا، هەتا ئێستا سێ سیمینار تایبەت کراوە بە مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی، لە شارەکانی (هەولێر، سلێمانی، سۆران). هەروەك تا ئێستا سێ مزگەوت بە ناویەوە ناونراوە لە شارەکانی (سلێمانی، سۆران، کەرکووك)، جگە لە هەندێ گوندی کوردستان.

* * *

# پێڕستی بابەتەکان

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|

* * *